پرۆژەی خوێندنەوە بۆ هەمووان
زنجیرە کتێبەکانی بڕیار «١٤»

# بالوولی حەکیم



ئامادەکردن و وەرگێڕانی
بەرزان ئەبوبەکر




# باڵووڵی حەکیم

ئامادەکردن و وەرگێڕانی

بەرزان ئەبوبەکر


چاپی یەکەم

١٤٣٦ك - ٢٠١٥ ز

نـــــاوی کـــتێـــب: بـالۆوڵی حـەکیم

ئامادەکردنو وەرگێڕانی: بەرزان ئەبوبەکر

دیزاین: گۆڤاری بڕیار

تیــراژ: ٢٠٠٠ دانـــــە

نۆبەی چاپ: یەکــەم

سـاڵی چاپ: ٢٠١٥

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردنی « ١١٧٥ »ی ساڵی « ٢٠١٥ »ی پێدراوە.

# بەناوی خودای بەرزو بێ هاوتا

## پێشەکی..

ئەم کتێبە، گوڵبژێرێکە لە چیرۆکو داستانو بەسەرهاتی باڵووڵی حەکیمو دانا، باڵووڵ.. عارفێکی دونیانەویستو زانایەکی پایەبەرزو حەکیمێکی بە ئەزموونو مامۆستای عاقڵان بوو..

باڵووڵی حەکیم.. هەموو ڕۆژەکانی ژیانی، پەندو چیرۆکو ئامۆژگاری بوو، سەرجەم ژیانو هەڵوێستو کردارو ڕەفتارو گوفتارەکانی، لێوان لێوبوون لە پەندو ئامۆژگاریی.. ئەو کەسەبوو کە خەلیفەو زانایانو فەرمانڕەوایان، هەمیشە داوایان لێکردووە، کە ئامۆژگارییان بکات، بە قسە نەستەقەکانی گوڵاوپرژێنیان بکات..

باڵووڵی حەکیم.. بۆ هەموو کێشەیەك چارەسەری گونجاوی لابووە، بۆ هەموو پرسیارێك وەڵامێکی بەجێو بەهێزی لابووە، بۆ هەر گرفتێك پێشنیاری بەسوودو پەسەندی لابووە..

حەکیم ئەو کەسە بوو کە هەمیشە لە بیری هاوکاریو یارمەتیدانو دەستگیرۆیی کەسانی ستەمدیدەو بێ نەواو هەژاراندا بووە.. هەموو کات خۆی فەرامۆش کردووە، بۆ خەڵکی، حەکیم خۆنەویستو دونیانەویستو زاهیدو عارفێکی سەردەمی خۆی بووە!

خوێنەرانی ئەزیز.. پەرتووکی باڵووڵی حەکیم، کۆمەڵێك چیرۆکو بەسەرهاتو داستانو هەڵوێستی ناوازەی باڵووڵی حەکیمە.. چیرۆکەکانی حەکیم ژمارەیان زۆرە، بەڵام ئێمە هەوڵمانداوە گوڵبژێرێك لە چیرۆکەکانی «حەکیم»تان پێشکەش بکەین،

کــه بــاس له بیرتیــژیو لێهاتوویىو زیرەکــیو دانایی باڵووڵی حەکیــم دەکەن، بە خوێندنەوەیان هەم چێژ وەردەگرینو هەم سوودو پەند..

هیوادارین کاتێکی خۆش بەسەربەرن، لەگەڵ حیکمەتو دانایی، پەندو ئامۆژگاریی، وتــەی جوانو پڕمانا، تێکەڵ بە بزەو پێکەنینو قســەی خــۆشو بە توێکڵ، لەگەڵ حەکیمی دانا، باڵووڵی مامۆستای عاقڵان!

ئومێدەوارم بە گوێی دڵ، چیرۆکەکانی ژیانی حەکیمی دانا بخوێنینەوە، تا سوود لە دانایىو بیرتیژیو هەڵوێستە ناوازەکانی وەربگرین.. چونکە تێڕوانینو هەڵوێستو بیرۆکەکانی حەکیم، دەگمەنو کەم وێنەن..

هیوادارم.. توانیبێتمان مەڵۆیەکی دیکە، بۆ سەر خەرمانی کتێبخانەی کوردی زیاد بکەینو پشوویەکمان بە ڕۆحی ئێوەی ئەزیز بەخشیبێت..

بەرزان ئەبوبەکر

٢٠١٥/٣/١



# کورسی خەلیفە

یەکێـك لـە نەریتی پاشـاکان لە ڕابــردوو ئێسـتادا، ئەوەیە ئەگــەر بیانەوێت کۆبوونەوەیەك لەگەڵ وەزیرو داروودەســتەکەیان، یان کەســانی بــە ئەزموونو داناو زانای شارو وڵاتەکەیان ساز بکەن، ئەوا لە دوای هەمووان دەچنە هۆڵی کۆبوونەوەکە، بۆئەوەی کاتێك پادشا دەچێتە نێو هۆڵی کۆبوونەوەکە، هەمووان بۆ بە گەورەزانینو ڕێزگرتنو شـکۆداری لەبەری هەڵسـن، نەك ئەم پێشـتر ئامادەبێو لەبەر کەسە بە تەمەنو نزیکەکانی هەڵسێت..

لەم چیرۆکەدا باس لە کۆبوونەوەیەکی خەلیفە هاروون دەکەین، ڕۆژێکیان هارونە ڕەشــید بە مەبەســتی کۆبوونەوە لەگەڵ کەسانی ژیرو خاوەن ئەزموونەکان، دەڕوات بۆ هۆڵی کۆبوونەوە، هەروەکو نەریتی هەمیشەیی دوای هەمووان بە ڕێدەکەوێت بۆ هۆڵی کۆبوونەوەکە، بەڵام شـتێکی سـەیر ڕووی دا، کاتێك خەلیفە هاروون گەیشتە

هۆڵی کۆبوونەوەکە، پێش ئەوەی دابنیشێت، باڵووڵ هەستاو چووە سەر کورسییەکەی، دیمەنەکە زۆر سەرنجڕاکێش بوو، خەلیفە هاروون ڕاوەستاوەو باڵووڵ لە شوێنەکەیدا دانیشتووە!!

دەستبەجێ پاســەوانەکانی خەلیفە باڵووڵیان گرتو لەبەردەمی خەلیفەو هەموو ئامادەبووان بە قامچیو شــەقو بۆکز دەســتیان بە لێدانی کرد.. باڵووڵ دەســتیکردە گریانو هاوارکردنو پاڕانەوە..

پاش ماوەیەك لە لێدانو سزادان، خەلیفە هاروون فەرمانی بە پاسەوانەکانی کرد کە دەست ڕاگرن..

خەلیفــە هاروون بــە باڵووڵی گوت: ئایا ســزاو لێــدانو قامچییــەکان، ئازاریان پێگەیاندیت؟

باڵووڵی ژیرو دانا، لە وەڵامدا وتی: نەخێر!!!

خەلیفە هاروون وتی: ئەگەر ئازارت نەبوو، ئەو هاوارو گریانو شیوەنەت لە چی بوو؟

باڵووڵی دانا وتی: لە ڕاســتیدا بۆ تۆ گریــام، بۆ حاڵی تۆ هاوارم دەکرد، بەزەییم بــە تۆدا دەهاتەوە، فرمێســکم بۆ تــۆ هەڵدەوەراند، دڵنیابە.. گریــانو هاوارکردنو شیوەنەکەم بۆ خۆم نەبوو، بەڵکو بۆ تۆ بوو!

خەلیفە هاروون بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆچی بۆ من گریایت، لە کاتێکدا قامچیو لێدانەکان بەر جەســتەی تۆ دەکەوتن، هاوارو ناڵەو گریانیش هەر لە ســنگی تۆوە دەردەچوو؟

باڵووڵی دانا وتی: من کەمتر لە یەك خولەك لەســەر ئەو کورســییە دانیشــتم، لەلایەن پاســەوانو ســەربازەکانی تۆوە، دوچاری ئەو هەموو قامچیو لێدانو ســزاو ئــازارە بوومەوە، بە جۆرێك کە هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەندە ئازارم پێنەگەیشــتووە، خۆ ئەگەر تۆ فەرمانت نەکردایە دەســت لە لێدانو سزادانم هەڵگرن، ئەوە دەستیان هەڵنەدەگرت!!

باشــه ئەگــەر من بۆ تەنها خولەكێك ئەوە ســزاكەم بێت، ئــەی تۆ كە چەندین ســاڵە لەسەر ئەو كورسییە دانیشــتووی، دەبێت لێدانو سزای تۆ چۆن بێت، لەلایەن فریشتەو پاسەوانەكانی دۆزەخەوە؟ ئەو كاتەی لە تۆ دەدرێت، كەسیش ناڵێت دەست هەڵگرنو ئیتر بەسییەتی!!

لەبەرئەوە كاتێك بیرم لە حاڵی تۆ كردەوە، بۆ تۆ دەستم بە گریانو هاوار كرد!!

بە بیســتنی ئەم وشــانە خەلیفە داوای لێبوردنی لە باڵووڵی حەكیم كرد، دواتر فەرمانی كرد كە ئامادەبووان پەندو كەڵك، لە وتەو كردەوەو هەڵوێســتە ناوازەكانو دانایی باڵووڵی زانا، وەربگرن!

ئەوەی لە هەمووی سەیرتر بوو ئەوەبوو، كە باڵووڵی دانا هەر كارێكی دەكرد، سەرەتا خەڵكی بە كارێكی سادەو شێتانەیان دەزانی، بەڵام پاش لێكدانەوەی دەردەكەوت، كە هەموو هەڵوێستەكانی لێوان لێون لە پەندو ئامۆژگاریی، بۆ دنیاو دوارۆژ!!



ئەگەر كورسیی دەسەڵات هەمیشەیی بوایە، بە تۆ نەدەگەیشت..

چونكە پێش تۆ، كەسانی دیكە لەسەری دانیشتوون!

# مرۆڤ لە گڵە، ئایا بە گڵ ئازاری دەگات؟

باڵـووڵ کەسـێکی حەکیمو زیرەكو ژیرو شـارەزاو دانا بـوو، باڵووڵ هەرچی لە ماڵو سامان دەستدەکەوت بۆ تێرکردنی برسییەکانو هاوکاریو یارمەتیدانی خەڵکی دەیبەخشی، زۆرینەی کات خواردنی تەنها نانو ئاوو خورما بوو!

لە یەکێك لەو هەڵوێستانەی باڵوولی دانا ڕووبەڕووی بووەوە، جارێکیان کەسێك، بانگەشـەی ئەوەی دەکرد کە داناو شـارەزاو لێهاتووە، بەڵام لە ڕاسـتیدا هیچ شتێکی سەبارەت بە ئاین نەدەزانی، ڕۆژێکیان خەڵکی لە دەوری خۆی کۆکردبووەوەو قسەی بۆ دەکردن، کاتێك باڵوولی دانا بە لایدا تێپەڕی، دانیشتو گوێی بۆ وتەکانی ڕادێرا، ئەو دەیگوت: بەهەشـتو دۆزەخ بوونیان نییە، چونکە هیچ کەس لە ئێمە نەمانبینیوون، لە هەمان کاتدا شەیتانیش بە ئاگری دۆزەخ ناسوتێت، چونکە شەیتان خۆی لە ئاگر دروستکراوە، چۆن بە شتێك دەسوتێتو ئازاری دەگات کە خۆی لەو شتە دروستکراوە، خەڵکەکـە هەموو بێدەنگبوون، چونکە هیـچ وەڵامێکیان پێنەبوو، بەڵام باڵوولی دانا چاوەڕێـی کرد، تا شـەو داهات، چـووە بەردەمی ماڵی ئەو پیـاوەو چاوەڕێی کرد تا بگەڕێتەوە، سەنگڵێکیشـی بەدەسـتەوە بوو، کاتێك کابرا گەڕایـەوە، بینی وا باڵووڵ

لەبەردەرگایماڵیان ڕاوەستاوە، پرسیاری لێکرد کە بۆچی لەبەردەرگای ماڵەکەی ڕاوەستاوە، بالووڵ لە بری وەڵامدانەوە سەنگڵەکەی کێشا بەسەریا، سەری شکاو خوێن بەسەریا هاتەخوارەوە، کابرا بەو حاڵەوە ڕۆیشت بۆ کۆشکی خەلیفەو سکاڵای لە دژی بالووڵ تۆمار کرد، خەلیفە فەرمانی کرد کە بالووڵ بانگهێشت بکەن بۆ کۆشك، کاتێك بالووڵ گەیشتە کۆشك، خەلیفە پرسیاری لێکرد کە تۆ سەری ئەم پیاوەت شکاندووە؟

بالووڵ وتی: بەڵێ..

خەلیفە وتی: بۆچی ئەو کارەت کرد؟

بالووڵ وتی: ئەمڕۆ ئەم پیاوە قسەی بۆ خەڵکی دەکردو دەیگوت: شەیتان بە ئاگری دۆزەخ ناسوتێتو بە ئاگر ئازاری ناگات، چونکە خۆی لە ئاگر دروستکراوە، منیش ئەو سەنگڵەم کێشا بەسەریدا کە لە گڵ بوو، بەڵام لەو بڕوایەدا نیم ئازاری پێگەیشتبێت، چونکە ئەو لە گڵ دروستکراوەو سەنگڵەکەش گڵ بوو، پرسی: ئایا ئازارت گەیشتووە بە سەنگڵەکە؟

وتی: بەڵێ: زۆریش ئازارم گەیشتووە.

بالووڵ وتی: چۆن بە شتێك ئازارت دەگات، کە خۆت لەو شتە دروستکراویت، دوای ئەوە کوا ئازارەکەتم پیشان بدە، دەمەوێت ئازارەکەت ببینم؟

کابرا وتی: خۆ ئازار شتێك نییە ببینرێت، بالووڵ وتی: کەواتە ئازار بوونی نییە، چونکە ناتوانین بیبینین..

خەلیفە وتی: ڕاستی بابەتەکە چییە؟

بالووڵ وتی: ئەم پیاوە دەڵێت: بەهەشتو دۆزەخ بوونیان نییە، چونکە کەس لە ئێمە نەیبینیون، ئەگەر مەرج بێت هەر شتێك نەبینرێت بوونی نەبێت، کەواتە ئازاریش بوونی نییە، چونکە نابینرێت، خەلیفە وتی: لە مەبەستەکەت تێگەیشتم، ئێستا دەتوانی بڕۆیت تۆ ئازادی.. وا ئەزانم ئەم پیاوەش وەڵامەکەی وەرگرتووە..

# هەموو سامانەکەت، یەکسانە بە یەک پەرداخ ئاو

«خەلیفە هارون زۆرجار داوای لە بالوولی زیرو دانا دەکرد، تا ئامۆژگاری بکاتو وانەو پەندی فێر بکات»..

ڕۆژێکیـــان بالوولی ژیرو حەکیم ســـەردانی خەلیفە هارونی کرد، خەلیفە هارون پێــی گوت: بالوولــی حەکیم، وانەیەکم فێربکەو کەمێــك ئامۆژگاریم بکە، بالوولی داناش کە هەرگیز بۆ قسە دانەدەماو لە کاتو ساتی خۆیدا قسەی زۆر سەرسوڕهێنەرو پەنــدی گەورەی فێــری خەلکی دەکرد، وتی: خەلیفە هارون، ئەگەر تۆ لە بیابانێکی چۆلو بێ ئاوو ئاوەدانی دوچاری تینوێتییەکی سەخت بوویتەوە، بە ئەندازەیەك کە نزیکی مەرگت بکاتەوە، لەو کاتەدا کەسێك بەرەو ڕووت هات، پەرداخێك ئاوی پێیە، ئایا بە چەند ئەو پەرداخە ئاوە دەکڕیت؟

خەلیفە هارون وتی: ١٠٠ دیناری زێڕی پێدەدەم..

بالوولــی حەکیم وتی: ئەی ئەگەر خاوەنەکەی بــە دینارو دراو ڕازی نەبوو، ئەو کاتە چی؟

خەلیفە هارون وتی: بۆئەوەی لە تینوێتیدا نەخنکێم، نیوەی موڵکو سەروەتو سامانەکەمی پێدەدەم!

باڵووڵ گوتی: باشە، ئەگەر ئاوەکەت خواردەوەو لە میزەڵانت گیراو نەهاتە دەرەوە، ئەو کات دوچاری ژانە سکێکی توندی کردیت، چەندی تر دەدەیت بۆ ئەوەی لەو ئازارە ڕزگارت ببێت؟

خەلیفە هارون وتی: نیوەکەی تری موڵکو سامانەکەمی پێدەدەم!

باڵووڵی ژیرو داناش گوتی: ئەی کەواتە بەچی لە خۆت بایی بوویت؟ بە موڵکو سەروەتو سامانێك، کە نرخەکەی یەك پەرداخ ئاو ناهێنێت؟!

چاکتر نییە کە بەشی زۆری موڵکو سامانەکەت لە ڕێی خودا ببەخشیتو دەستی لێقەوماوو نەدارانو بێباوکان بگریتو دڵی ئەوان خۆش بکەیتو بەسەریان بکەیتەوە؟!

مەڵێ هەژارم کوفری نیعمەتە
لەشی ساغ بۆ تۆ موڵکو سەروەتە





# کیژۆڵەیەکی جوان!

باڵووڵ ئەو مرۆڤەی کە هەموو ژیانی پەندو ئامۆژگاریو قسەی نەستەقو زیرەکی بوو، ئامۆژگاریو زیرەکیو لێهاتوویيو بوێری ئەم دانایە، کۆشکی فەرمانڕەواو خەلیفەکانی تێپەڕاندبوو، زۆرجار کە دەگەیشت بە خەلیفەو فەرمانڕەواکان، داوایان لێدەکرد تا ئامۆژگاریان بکات..

باڵووڵ هەر شتێکی ببیستایە، یاخود بەرچاوی بکەوتایە، دڵسۆزانەو بوێرانە ئامۆژگاری بەرامبەرەکەی دەکرد، لە هەر ئاستو پلەو پایەیەکدا بووایە..

ئەمجــارە باس لە زیرەکییەکی دیکەی باڵــووڵ دەکەین، کە چۆن بە ئامۆژگاریی لێکدانەوە زیرەکییەکانی مرۆڤەکانی لە خەمو پەژارەو نارەحەتی ڕزگار کردووە..

فەرمانــڕەوای کوفە خێزانەکــەی منداڵی بوو، منداڵەکــەش کیژۆڵەیەکی جوانو تەندروســت بوو، بەڵام لەبەرئــەوەی فەرمانڕەواکان لە هەموو ســەردەمێکدا زیاتر لــە چاوەڕوانی ئەوەدان کە خێزانەکانیــان کوڕیان بۆ بهێننە بەرهەم، زۆر خەمبارو بێتاقــەتو نیگــەران بوو، تەنانــەت ڕێگەی نــەدەدا هیچ کــەس پیرۆزبایی منداڵە نوێیەکەیان لێ بکات، ئەم هەواڵە گەیشــتە باڵوولی ژیرو دانا، بە هەر جۆرێك بێت خۆی گەیاندە لای فەرمانڕەوا.. کاتێك بەو بارودۆخەوە چاوی کەوت بە فەرمانڕەوا، پێی گوت: دەبینم خەمبارو نیگەرانیت؟

فەرمانڕەوا لە وەڵامدا گوتی: چاوەڕوانی لە دایکبوونی کوڕ بووم، بەڵام بەداخەوە خێزانم ئەمجارەشیان کچی بووە!

باڵوولی ژیرو حەکیم وتی: ئایا حەزت دەکرد لە بری ئەو کچە جوانو تەندروستو چاو گەشە، خودای گەورە کوڕێکی کەمئەندامی پێ ببەخشیتایە؟! یان شێتێکی وەکو من بووایە؟!

بۆچی سوپاسی خودا ناکەیت، کە منداڵەکەت ساغو سەلامەتو تەندروستە!

چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان کوڕو کچدا؟!

بە بیســتنی ئەم وشانەی باڵووڵ، فەرمانڕەوا دەستی کردە قاقای پێکەنین، ئیدی خــەم و پەژارەی ڕەوییەوەو شــادو دڵخۆش بوو، پاشــان سوپاســی خودای گەورەی کرد، لەســەر ئەو نیعمەتەو دواتریش سوپاســی باڵوولی کرد، بۆ ئەو ئامۆژگارییە بە نرخەی!

بۆ ڕۆژی دواتر فەرمانڕەوا خواردنی زۆری ئامادەکردو مۆڵەتی دا، تا خەڵکی بێن بۆ پیرۆزبایی منداڵە تازە لە دایکبووەکەیان!

لە پشت هەر پیاوێکی ئازاوە، ژنێکی پاڵەوان هەیە!

# باڵۆوڵ و بازرگان!

ڕۆژێك بازرگانێكی خەڵكی شاری بەغداد، بە مەبەستی ڕاوێژكردن، ڕۆیشت بۆ لای باڵووڵی ژیرو داناو لێی پرسی: باڵووڵی حەكیم بە بۆچوونی تۆ من چ كەلوپەلێك بكڕم، تا قازانجێكی زۆری لێ بكەم؟

باڵووڵیش لە وەڵامدا گوتی: بڕۆ ئاسن‌و لۆكە بكڕە.

بازرگان ڕۆیشت ئەندازەیەكی زۆری ئاسن‌و لۆكەی كڕی، دوای چەند مانگێك ئاسن‌و لۆكەكەی فرۆشتەوەو سوودو قازانجێكی زۆری لێكرد.. پاش تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك بەسەر قازانجی بازرگانیەكەیدا، بازرگان گەیشتەوە بە باڵووڵی حەكیم، بازرگان كە قازانجێكی زۆری كردبوو، لە بری سوپاس‌و پێزانین بە لە خۆباییبوونەوە وتی: باڵووڵی شێت، ئەمجارەیان بە بۆچوونی تۆ چ شتێك بكڕم، بۆئەوەی سوودو قازانجی زۆری لێ بكەم؟

باڵوولی حەکیم لە وەڵامی بازرگانی لە خۆباییدا وتی: برۆ پیازو کاڵەك بکرە!

بــازرگان لەبەرئەوەی لە جاری یەکەمدا ســودو قازانجــی زۆری بە هۆی ڕاوێژی باڵووڵەوە کردبوو، بێ سێو دوو ڕۆیشت ئەندازەیەکی زۆری پیازو کاڵەك کڕی.

دوای ماوەیەکــی کــەم، تەواوی پیازو کاڵەکەکان ڕزینو تیاچوون، جگە لە فڕێدان بۆ هیچ شتێکی دیکە نەدەبوون، بازرگان زیانێکی زۆری کرد، هەربۆیە کەوتە گەڕان بە دوای باڵوولی حەکیمو دانادا، کاتێك باڵوولی بینی زۆر بە تووڕەییەوە وتی: جاری یەکەم کە پێت وتم، ئاسنو لۆکە بکڕە، بە هۆی پێشنیارەکەتەوە قازانجی باشم کرد، بەڵام جاری دووەم ئەوە چ پێشــنیارێك بوو بۆ منت کرد، ماڵت وێران کردم، زەرەرو زیانێکی زۆرم کرد..

باڵوولی حەکیم لە وەڵامی بازرگانەکەدا وتی: جاری یەکەم کە هاتی بۆ لام، ژیرانە بانگت کردمو وتت، باڵوولی حەکیمو دانا، منیش ژیرو دانایانە وەڵامم دایتەوە، بەڵام لە جاری دووەمدا بانگت کردم باڵوولی شێت، منیش شێتانە وەڵامم دایتەوە!

بازرگان بە بیستنی ئەم وەڵامە زۆر شەرمەزار بوو!



حەکیم وەڵامەکانی بۆ ئەو کاتو بۆ ئێستاو بۆ ئایندەش هێندە بەهێزبووە، کە دەگرێت هەمووان پەندی لێوەربگرین، لە وتەو وەڵامەکانی ڕابمێنین، بە وردی سەرنج لە قسەکانی بدەین، چونکە سەرجەم وەڵامو قسەکانی بەسودو بەهێزو پڕ مانابووە!

جارێکیان کابرایەك لە ڕێگەدا گەیشت بە باڵووڵی حەکیم، گوتی: جەنابی حەکیم، دەمەوێت بڕۆم بۆ لەسەر لوتکەی ئەو کێوە بڵندە، دەتوانی نزیکترین ڕێگەم پێ بڵێی؟ تا بەکەمترین کاتو ماندووبوونێکی کەم بگەمە لوتکەی کێوەکە؟

حەکیم وەڵامی دایەوەو گوتی: نزیکترینو ئاسانترین ڕێگە، ئەوەیە کە نەڕۆیت بۆ لوتکەی ئەو کێوە! چونکە تۆ دەتەوێت بگەیت بە لوتکەی کێوەکە، بەڵام لە دووری ڕێگەکەو ماندووبوونت دەترسیت!

حەکیم مەبەستی ئەوەبوو، نابێت مرۆڤ بیەوێت بەرەو لوتکەو هیوا بڕوات، بۆ ئەنجامدانی کارێك بڕوات، یا بۆ هێنانەدی ئاواتێکی بڕوات، یان مرۆڤ بیەوێت شتێك بە دەستبێنێت، یاخود بە هیوایەکی لە مێژینەی شاد بێت، بەڵام نەیەوێت ماندوو ببێت، نەیەوێت لەو پێناوەدا ئارەق بڕێژێت!

کەواتە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت پلە بڵندی بەدەست بێنێت، پلە بڵندی شەونخوونی دەوێت، بۆ گەیشتن بە ئاواتو هیواکانمان پێویستمان بە ماندووبوونو ئارامگرتنو هەوڵدانە.. پێویستمان بە ورەی بەرزو بڕوا بە خۆبوونو بەردەوامییە!

ئاواتەکان هیچ کات بەبێ دەردەسەریو ماندووبوون نایەنە دی، هیواکان گەر کردارییان لەگەڵدا نەبێت، هەرگیز چرۆ ناکەن، چرۆکانیش بەبێ بەردەوامی هەر زوو وشك دەبنو هەڵدەوەرێن.. کەواتە بۆ گەیشتن بە هیواکانت.. هەوڵ بدە، ماندووبە، بەردەوامبە.. دڵنیابە هەر ئاواتێك ئەم سێ خاڵەی لەگەڵدا بێت (هەوڵدانو ماندوبوونو بەردەوامبوون)، ئەمڕۆ، یان سبەی دێتەدیو خەونەکەت دەکاتە واقیعو ژیانت ئاسوودەو کامەران دەکات.. هاوڕێبوون لەگەڵ ئەو سێ خاڵەدا هیواو ئاواتە سەختەکان دەکاتە واقیعو ڕوخسارە پڕ لە خەمەکان خەندەباران دەکاتو دڵە تەنگەکان ئاوەدان دەکاتەوەو نێوچەوانە تاریکەکان بە ئەندازەی مانگی چواردە، ڕووناك دەکاتەوە.

# بۆنی خواردن دەفرۆشرێت؟

ڕۆژێکیان کابرایەکی دەشتەکی هەژار بە بازاڕدا تێپەڕی، چاوی بە چێشتخانەیەك کەوت، کاتێك بینی چێشتلێنەرەکە سەری مەنجەڵەکەی هەڵدایەوە، بۆنێکی زۆر خۆشی چێشتەکە بڵاوبووەوە، ئەویش زۆر بە تامەزۆرییەوە بۆنی چێشتەکەی کرد.. دواتر ڕۆیشتو کەمێك لە چێشتخانەکە دوورکەوتەوە، خاوەنی چێشتخانەکە بانگی کردو گوتی: تۆ لە هەڵمی خواردنو چێشتەکەی من سوودت وەرگرت، دەبێت نرخی ئەو بۆنو بەرامەیە بدەیت.. قسەیەك لە کابرای دەشتەکیو قسەیەك لە خاوەن چێشتخانە، دەنگیان بەرزبووەوەو خەڵکی لێیان کۆبوونەوە.. ئەو پیاوە بێچارەی کە تەنها بۆنی خواردنەکەی کردبوو، لە دوورەوە باڵوولی داناو حەکیمی بینی، بانگی

کردو تکای لێکرد، کە داوەری نێوانیان بکات.. کاتێك باڵووڵ گوێبیستی هەردوولایان بوو، بە خاوەنی چێشتخانەکەی گوت: ئایا ئەم پیاوە لە خواردنەکەی تۆی خوارد؟

خاوەنی چێشتخانەکەش گوتی: نەخێر، بەڵام ئەو سودی لە بۆنی چێشتەکەی من بینیوە!

باڵووڵ چەند سکەیەکی زیوی دەرهێناو نیشانی خاوەن چێشتخانەکەیداو فرێی دایە سەر زەوی، تا زرنگەی لێوە بێت.. پاشان گوتی: فەرموو دەنگی سکە زیوییەکە وەربگرە!

خاوەنی چێشتخانەکە زۆر بەسەرسوڕمانەوە گوتی: ئەوە چ جۆرە پارەدانێکە؟

باڵووڵی حەکیم گوتی: ئەوە هاوشێوەی دادوەریەکەی تۆیە، کەسێك بۆنی چێشتەکەی بفرۆشێت، دەبێت لە بەرامبەردا دەنگو زرنگەی پارە وەربگرێت..



ڕۆژێك باڵووڵ سەردانی خەلیفە هاروون دەکات، لە کاتێکدا خەلیفە هاروون لە نێو کۆشکەکەی نزیك ڕووباری دیجلە لەگەڵ کۆمەڵێك پیاوماقوڵو کەسانی بە ئەزموونو شـارەزا دانیشتبوو.. باڵووڵ دوای سڵاوکردن، ڕۆیشت لە تەنیشت خەلیفە هاروونەوە دانیشـت، خەلیفـە هاروون لـەو ڕەفتارەی باڵووڵ ناڕەحەت بوو، هەر بۆیە ویسـتی لـە بەرچاوی میوانەکان بچووکی بکاتەوە، بۆ ئەم مەبەسـتە پێی گوت: میوانەکانم پرسـیارێکیان هەیە، ئەگەر توانیت دەسـتبەجێ وەڵامیان بدەیتـەوە، هەزار دیناری زێڕت پێدەبەخشـم، ئەگەر وەڵامەکەت نەزانی، ئەوا ڕیشو سمێڵت دەتاشینو سواری وڵاخێکت دەکەینو بە ناو بازاڕو کوچەو کۆڵانەکانی شاری بەغدادا دەتسوڕێنینەوە..

باڵووڵی حەکیمو دونیا نەویست وتی: من پێویستم بە زێڕو دیناری تۆ نییە، بە یەك مەرج ئامادەم وەڵامی پرسیارەکەتان بدەمەوە، دەبێت لە بەرامبەردا سەد کەس لە دۆستانی ئێمە، کە لە زیندانەکانی تۆدا ژیان دەگوزەرێنن، ئازاد بکەیت! خۆئەگەر نەمتوانی وەڵام بدەمەوە، فڕێم بدەنە نێو ڕووباری دیجلەوە..

پرسیارەکە بەمشێوەیە ئاڕاستەی باڵووڵ کرا: ئەگەر مەڕێكو گورگێكو چەپکەیەك گیـات پێبێـت، بتەوێت یەك یەك بیانبەیتە ئەوبەری ڕووبارەکە، بە شـێوەیەك کە نەمەڕەکە گیاکە بخواتو نە گورگەکەش مەڕەکە بخوات.. چی دەکەیت؟

باڵووڵ گوتی: یەکەمجار مەڕەکە دەبەمە ئەوبەری ڕووبارەکە، پاشان دەگەڕێمەوە گیاکە دەبەمە ئەوبەری ڕووبارەکە، لەگەڵ دەستی خۆم مەڕەکە دەهێنمەوە ئەمبەری ڕووبار، پاشـان گورگەکە دەبەمە ئەوبەری ڕووبارەکە، کۆتاجار دەگەڕێمەوە مەڕەکە دەبەمەوە ئەوبەری ڕووبارەکە، بەو شـێوەیە هەر سـێکیان بە سەلامەتیو یەك یەك دەگەیەنمە ئەوبەری ڕووبارەکە..

خەلیفە هاروون گوتی: ئافەرین، وەڵامەکەت زۆر ڕاسـتە، بڕیاریدا سـەد کەس لە دۆستانی باڵووڵ لە زیندان ئازاد بکرێن..

مرۆڤە ژیرەکان دونیا نەویسـتن، ئاسـوودەیی دەوروبەریان لە پارەو سـامان لەلا گەورەترو گرنگترە..

# کاممان شێتین؟

ڕۆژێـــك باڵوولی حەکیم، دەڕوات بۆ ســەردانی یەکێك لە گۆڕســتانەکانی شــاری بەغداد، لە نێو گۆڕســتانەکە دادەنیشــێو دەکەوێتە جیهانــی خەیاڵەوە، لەو کاتەدا خەلیفــە هارون بە لای گۆڕســتانەکەدا گوزەر دەکات، دەبینێــت باڵووڵ بە تەنها لە گۆڕستان دانیشتووە، زۆر بە توورەییەوە پێی دەڵێت: باڵووڵ تۆ کەی عاقڵ دەبیت؟

باڵووڵیش ســەردەکەوێتە ســەر درەختێکی بەرزو بە دەنگێکی بەرز دەڵێت: ئەی هارون، ئەی شێت، تۆ کەی عاقڵ دەبیت؟

هارونیــش لێــی نزیــك دەبێتــەوەو دەچێتە ژێر درەختەکەوەو بەســەر پشــتی ئەسپەکەیەوە دەڵێت: من شێتم، یان تۆ شێتی کە بە تەنها لە گۆڕستان دانیشتووی؟

باڵووڵ دەڵێت: من کەسێکی ژیرم، تۆش شێتی؟

هارون دەڵێت: چۆن؟

باڵــووڵ: بە دەســتی ئاماژە بۆ کۆشــکەکانی هارون دەکاتو دەڵێــت: چونکە من دەزانم ئەو کۆشــکانە هەمیشــەیی نین، کاتینو لەناودەچن، تەنها بۆماوەیەکی کەم

خاوەنەکانیان لە نێویاندا دەحەسێنەوە، پاشـان ئاماژەش بۆ گۆڕستانەکە دەکاتو دەڵێت: ئەمە ماڵی هەمیشەییو سەرەنجامی هەموو مرۆڤەکانە!

من دەمەوێت ئەم ماڵەم ئاوەدان بکەمەوە، پێش ماڵی دنیام، بەڵام تۆ کۆشکەکانی دنیـات ئاوەدان دەکەیتەوە، ئەم ماڵەش (ئامـاژە بۆ گۆڕەکە دەکات)، وێران دەکەیت، لەبەرئـەوە ڕقت لەو ڕۆژەیە کە لـە ئاوەدانییەوە دەگوێزرێیتەوە بۆ ماڵێکی وێرانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانیت ئەوە سەرەنجامی هەمووومانەو دەربازبوون لێی ئاستەمە! ئێستا تۆ پێم بڵێ، کاممان شێتین؟

بەبیستنی ئەم ئامۆژگارییانەی بالوول، هارونە ڕەشید دڵی کەوتە جۆشو دەستی کرد بە گریانو هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوەو بە دەنگێکی پڕ لە گریان وتی: سوێند بە خودا تۆ ڕاست دەکەیت!!

پاشان وتی: ئەی بالوول زیاتر ئامۆژگاریم بکە..

بالوول: پەیامی خوای گەورە بەسە بۆ ئێمە، پابەندبە پێوەیو جێبەجێی بکە..

پاشان هارون وتی: ئایا داواکارییەکت هەیە تا بۆت جێبەجێ بکەم؟

بالوول: بەڵێ، تەنها سـێ داواکاریم هەیە، ئەگـەر بتوانی بۆم جێبەجێ بکەیت.. ئەوا زۆر سوپاست دەکەم..

هارون وتی: داواکانت بکە..

بالوول:

- دەمەوێت تەمەنم زیادبکەی!
- لە فریشتەی گیان کێشان بمپارێزە!
- دەمەوێت بمخەیتە بەهەشتەوەو لە دۆزەخ دوورم بخەیتەوە!!

هارون: ببورە ئەوانە لە توانای مندا نین!

بالـوول: کەواتە بزانە کە تۆش هەروەکو مرۆڤەکانی دیکە بەندەی، نەك پادشـا، منیش هیچ پێویستییەکم بە بەندەیەکی وەکو بەڕێزتان نییە!

# باڵووڵ و فەرمانڕەوای کوفە

فەرمانڕەوای کوفە لای خەڵکی بە کەسێکی چروکو ڕەزیلو دەست نوقاو ناوبانگی دەرکردبوو، بەڵام هیچ کەس نەیدەوێرا ئەم ڕاستییە لە بەردەمیدا بدرکێنێت..

ڕۆژێکیان فەرمانڕەوای کوفە ویستی کاتێکی خۆش بەسەربەرێتو کەمێك گاڵتەو سوعبەتو قسەی خۆش بکات، بیری کردەوە باشترین ڕێگە بۆ بەسەربردنی کاتێکی خۆشو پڕ لە گاڵتەو گەپ، لە هەمان کاتدا هیچیشی تێنەچێت، باڵووڵی بە خەیاڵدا هات، پاسەوانەکانی ڕاسپارد تا بڕۆن باڵووڵی بۆ بانگ بکەن، کاتێك باڵووڵ گەیشتە کۆشك، فەرمانڕەوا ویستی بە چەندین پرسیار شەرمەزاری بکات، بەڵام هەرچەند پرسیاری ئاڕاستە دەکرد، باڵووڵ وەڵامێکی گورجکبڕی دەدایەوە، بەشێوەیەك کە

فەرمانڕەوا شـەرمەزار دەبوو، فەرمانـڕەوا ناچار بۆئەوەی لەو قەیرانە دەرباز بێت، کە بە دەسـتی خۆی سـازی کردووە، بە باڵووڵی گوت: بیستوومە کە تۆ، سەبارەت بە سەگی ڕاو، شارەزایی باشت هەیە..

باڵووڵ وتی: خۆزگە وابووایە، مەبەستت چییە لەم پرسیارە؟

فەرمانڕەوا وتی: تۆ دەزانیت کە من زۆر حەزم لە ڕاوو ڕاوشـکارییە، لەبەرئەوە دەمەوێت سەگێکی باشم بۆ پەیدا بکەیت، بۆ ڕاوکردن.

باڵووڵ: هەوڵ دەدەم ئەو داواکارییەت بۆ جێبەجێ بکەم.. لەگەڵ ئەم قسـەیە ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو لای فەرمانڕەوا.. ئەوەبوو باڵووڵ لە شوێنی خۆی نەجوڵا!

فەرمانڕەوا: دەمەوێت هەر ئێستا بڕۆی داواکارییەکەم بۆ جێبەجێ بکەیت..

باڵووڵ: بە چاوان هەرئێستا دەڕۆم، دوای چەند ڕۆژێك دەگەڕێمەوە بۆ لاتو ئەو سەگەت بۆ دەهێنم کە داوات کردووە.

دوای چەند ڕۆژێك باڵووڵ هاتەوە بۆ کۆشـك، سـەگێکی قەڵـەوی لەگەڵ خۆیدا هێنابـوو، کاتێك فەرمانڕەوا چاوی کەوت بەو سـەگە قەڵـەوە، زۆر بە تووڕەییەوە گوتی: مەگەر تۆ شێت بوویت؟

باڵووڵ: بۆچی شێت بووم، جەنابی فەرمانڕەوا، شتێك ڕوویداوە؟

فەرمانڕەوا بە تووڕەییەوە گوتی: ئایا تۆ نازانی سیفاتی سەگی ڕاو چییە؟

باڵووڵ بە هێمنی وەڵامی دایەوەو گوتی: بەڵێ دەزانم!

فەرمانڕەوا گوتی: زۆرباشە، ئێستا سیفاتەکانی سەگی ڕاومان پێ بڵێ..

باڵووڵ: سـەگی ڕاو دەبێت لەش سووکو لاواز بێت، بۆئەوەی بتوانێت بە خێرایی ڕابکاتو بە ئاسانی نێچیرەکەی بگرێت.

فەرمانـڕەوا: ئەگـەر ئەوە دەزانیت بۆچی سـەگێکی ئاوا قەڵـەوت لەگەڵ خۆت هێناوە؟

فەرمانڕەوا لە تووڕەییدا ڕوخساری سوور داگیرسابوو، باڵووڵیش ئەم کارەی بۆیە

کردبـــوو کە وانەیەك فێری فەرمانـــڕەوا بکات، حەکیمانە وەڵامـــی دایەوە: جەنابی فەرمانـــڕەوا، تـــووڕە مەبـــە، تۆ بەو چرووکـــیو ڕەزیلییەی کە ناســـراویت لە نێوان خەڵکیـــدا، تەنها لە ماوەی یەك هەفتەدا ئەم ســـەگە دەکەیتە ســـەگێکی لەڕو لاواز، بەشێوەیەك کە سەگی ڕاویش بە ئەندازەی ئەو، نەتوانن ڕابکەن..

فەرمانڕەوا، سەری ڕاوەشاندو ڕووی کردە خەڵکەکەو گوتی: ئایا ئێوە دەزانن، کە من کەسێکی ئەوەندە ڕەزیلو چرووکم؟ قسەکانی باڵووڵ ڕاستە؟

ئامادەبـــووان وەڵامیـــان دایەوە: بەڵـــێ جەنابی فەرمانڕەوا، باڵووڵی حەکیم ڕاســـت دەکات..

فەرمانڕەوا بە تووڕەییەوە وتی: دایکتان ڕۆڵە ڕۆڵەتان بۆ بکات..

بەپەلە بەجێی هێشتن، تا لەو شەرمەزارییە خۆی دەرباز بکات..

ڕژدیو چرووکی، دزیکردنە لە خۆتو دەستبڵاوییە بۆ میراتگرەکانت!



# بالوول و کۆشکی خەلیفە

خەلیفە هارونە ڕەشید کۆشکێکی لەسەر جوانترین شێوەو دیزاینی ئەو سەردەمەی خۆی دروستکرد، کاتێك کۆشکەکەی تەواو بوو، فەرمانی کرد بە وەزیرەکەی کە بە نێو تەواوی شارو شەقامەکانی بەغدادا بگەڕێتو خەڵکی ئاگادار بکاتەوە، کە دەبێت هەموو دانیشتوانی شار سەردانی کۆشکی خەلیفە بکەنو بە وردی سەرنجی بدەن، تا هەر کەسێك ڕەخنەو پێشنیارێکی لەبارەی کۆشکەوە هەیە، سوودی لێببینینو کۆشکەکەی پێ ڕازاوەتر بکەن، بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ بە شەقامەکانی بەغدادا ئاگادارییان بڵاوکردەوە، خەڵکی لە هەموو ناوچەیەکەوە هاتن بۆ بینینی کۆشکی خەلیفە، بە بینیی سەرسامو دڵخۆشبوون، هیچ کەس نەیتوانی تەنها ڕەخنەیەکی لێ بدۆزێتەوە، دوای حەوت ڕۆژ هارونە ڕەشید وتی: ئایا کەسێك ماوە کۆشکەکەی نەبینیبێتو بە دەم داواکارییەکەمانەوە نەهاتبێ؟

وەزیر گوتی: بەڵێ تەنها یەك کەس نەهاتووە بۆ بینینی کۆشك، وتی: ئەو کەسە کێیە ئاگاداریو بانگەوازی ئێمەی بیستووەو نەهاتووە بەدەم داواکارییەکەمانەوە؟

وەزیـــر گوتـــی: تەنها باڵوولی حەکیم نەهاتووە، هـــارون فەرمانی کرد کە لە هەر شوێنێك هەیە بڕۆن بیهێنن!

وەزیر بە سواری ئەسپەکەی بە ڕێکەوت تەواوی شاقامو کۆڵانەکانی بەغداد گەڕا، بەڵام باڵوولی نەبینی، لە هاوڕێیەکی پرسی کە باڵووڵت نەبینیوە؟

وتـــی: ئەگەر لە شـــار لە نێو زینـــدووەکان نەبێت، کەواتە بۆ دیـــداری مردووان ڕۆیشتووە، وەزیر بەڕێکەوت بۆ گۆڕستانی شار، سەیری کرد ئەوا باڵووڵ لە نێوان دوو گۆڕدا دانیشـــتووەو عەمامەکەی بەسەرەوە نەماوەو ئێسقانێکی بە دەستەوە گرتووەو بەدەم گریانەوە لەبەرخۆیەوە قسە دەکات.

وەزیر ســـڵاوی لێکردو گوتی: باڵوولی حەکیم، بۆچی زیندووەکانت جێهێشـــتووەو هاتوویت بۆ لای مردووەکان؟

باڵووڵ گوتی: من لە لای کەســـانێك دانیشـــتووم کاتێك جێم هێشـــتن، غەیبەتم ناکەن، کاتێکیش لایان دادەنیشـــم، ئازارم نادەن، بیرکردنەوە لە ژیانی ئەوان پەندو ئامۆژگارییە..

پاشـــان وەزیر گوتی: خەلیفە هارون داوای کردووە کە بەڕێزتان ســـەردانی بکەن، باڵووڵ گوتی: خەلیفە چ پێویستییەکی بە من هەیە؟

گوتی: دەیەوێت بۆچوونی تۆ بزانیت ســـەبارەت بە کۆشکەکەی! پاشان پێکەوە بە ڕێکەوتن بۆ کۆشـــکی خەلیفە هارون، سڵاوی لە خەلیفە کردو ئەویش بە جوانترین شـــێوە وەڵامی دایەوەو فەرمانی پێکرد دابنیشێت، باڵووڵ دانیشتو چاوەکانی بڕییە زەوییەکە، نە سەری هەڵبڕی بۆ لای خەلیفە، نە تەماشای کۆشکە نوێیەکەی دەکرد، خەلیفە هارون پێی گوت: بۆچی سەیری کۆشکەکەم ناکەی؟ من لەبەرئەوە ناردوومە بە دوای تۆدا تا بە وردی ســـەیری کۆشـــکەکەم بکەیت، ئەگـــەر هەر کەموکوڕییەکی تێدایە پێمان بڵێ، تا چاکی بکەین؟!

باڵووڵی حەکیم گوتی: جەنابی خەلیفە ئەم کۆشــکەی تۆ دوو عەیبی ســەرەکیو زۆر ڕوونی تێدایە.. یەکەمیان ئەوەیە کە خاوەنی ئەم کۆشــکە دەمرێتو کۆشکەکەی جێدەهێڵێت، دووەمیان کۆشکەکەش دەڕووخێتو نامێنێتەوە!

هارون بە بیستنی ئەم وشەیە زۆر تووڕەبوو، وتی: باڵووڵ تۆ هاتووی سەرەخۆشیمان لێ بکەی، یان پیرۆزباییمان لێ بکەی! باڵووڵی حەکیم وتی: کۆشکەکەی تۆ زیاتر لە سەرەخۆشییەوە نزیکترە تا پیرۆزبایی، پاشان شیعرێکی بەسەردا خوێندەوە..

خەلیفە یەکجار سەرســام بوو بە قســەکانی باڵووڵ، هەر لەبەرئەوە داوای لێکرد زیاتــر ئامۆژگاری بــکات.. باڵووڵی حەکیمیــش چەند پارچە شــیعرێکی دیکەی بۆ خوێندەوەو تیایدا ئامۆژگاری کرد کە دنیا کۆتایی دێتو توێشوو هەڵگرێت بۆ ڕۆژێك کە دینارو درهەمو کۆشكو تەلار، سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت..





# باڵووڵ و جونەیدی بەغدادی

جونەیدی بەغدادی یەکێك لە زاناو شـــارەزاو کەسە بەناوبانگەکانی شاری بەغداد بوو، ڕۆژێکیان لەســـەر زاری قوتابییەکانی ســـەبارەت بە ئاکارو قســـە نەستەقەکانی باڵووڵ هەندێك شتی بیست، جونەید پرسی: ئەو باڵووڵە کێیە؟

هەندێك لە قوتابییەکانی وتیان کەســـێکی ســـەرگەردانە، ئەو شوێنو جێگەیەکی دیاریکراوی نییە..

جونەیـــد وتی: حەزدەکـــەم چاوم پێی بکەوێـــت، تکایە بڕۆن بزانـــن لە کوێیەو بانگهێشتی بکەن بۆ لام، تا کەمێك قسەی لەگەڵدا بکەم، چونکە من لە بارەی ئەوەوە زۆر شتی سەیرو سەرسوڕهێنەرم بیستووە..

قوتابییەکانی شـــێخ جونەید هەموو کۆڵانو کوچەیەك لە ناو شاردا گەڕان، بەڵام لە هیچ شـــوێنێك نەبوو، لە کۆتاییدا لە دەرەوەی شـــار دۆزییانەوە، پێیان گوت: کە مامۆستاکەمان دەیەوێت چاوی بە تۆ بکەوێت..

باڵووڵی حەکیم گوتی: ئەگەر ئەو پێویستی بە منە، دەبێت ئەو بێت بۆ لای من.

کاتێك ئەم هەواڵەیان بە شـێخ جونەید گەیاند، وتی: ئەو ڕاسـت دەکات، دەبێت ئێمە بڕۆین بۆ لای ئەو، شـێخ جونەیدو قوتابییەکانی بە ڕێکەوتن بۆ لای باڵووڵی دانا، لە ناوەڕاسـتی بیابان چاویان بە باڵووڵ کەوت، سـەری خستبووە سەر بەردێكو بیری لە چوار دەورەکەی دەکردەوە..

شـێخ جونەیدو قوتابییەکانی سـڵاویان لە باڵووڵی حەکیـم کرد، باڵووڵ وەڵامی دانەوەو هەڵسا لە تەنیشت مامۆستاوە دانیشتو پرسی تۆ کێی؟

ئەویـش لە وەڵامدا گوتی: من جونەیدی بەغدادیم.. وتی: ئیشـت چییە؟ شـێخ جونەید ئاماژەی بۆ قوتابییەکانی کردو وتی: کاری من پەروەردەکردنو ڕێنموونیکردنی مرۆڤەکانە..

باڵـووڵ بە خەندەوە وتی: ئەگەر تۆ مامۆسـتاو شـارەزای، ئایا ئادابی نانخواردن دەزانیت؟

شـێخ جونەید زۆر بە متمانەوە وتی: «سـەرەتا بە ناوی خودا دەسـت پێدەکەم، لەبەردەمی خۆمەوە دەخۆم، هێواش هێواش نانەخۆم، بە هێواشی پاروەکە دەجوم، سـەیری خواردنی دەوروبەرم ناکەم، دوای تەواوبوون سوپاسـی خوای گەورە دەکەم، دەستەکانیشم لە پێش نانخواردنو دوای نانخواردن دەشۆرم».

باڵووڵ هەسـتایە سـەرپێو گوتی: مامۆسـتا چۆن ڕێنموونی خەڵکی دەکەیت، لە کاتێکدا تۆ ئادابی نانخواردن نازانیت؟

شـێخ جونەید بە وەڵامەکەی باڵووڵی حەکیم سەرسام بوو، قوتابییەکانی گوتیان: خۆت بێتاقەت مەکە ئەو پیاوێکی دێوانەیە، بەڵام شـێخ جونەید بڕوای بەو قسـەیە نەکرد، لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەو دێوانە بێت.. باڵووڵ ڕۆیشـتو ئەوانی جێهێشـت، شـێخ جونەید بانگی کرد: تکایە من پێویسـتم پێتە.. باڵووڵ وەڵامی دایەوە: باشـە ئەگەر تۆ ئادابی نانخواردن نازانیت، ئایا ئادابی قسەکردن دەزانیت؟

شـێخ جونەید وتی: بەڵێ، (تەنها بە ئەندازەی پێویسـت قسـە دەکەم، قسـەی

نابەجێ ناکەم، ئەگەر قسەم بۆ خەڵکی کرد بە ئەندازەی توانای ژیرییان قسەیان لەگەڵدا دەکەم، بانگیان دەکەم بۆ ڕێگەی خوداو پێغەمبەرەکەی «سەلامی خوای لێبێت».. هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو.. بالوول دەستی کردەوە بە ڕۆیشتن، قوتابییەکانی شێخ جونەید بانگیان کرد چاوەڕێ بکە با مامۆستا قسەکانی تەواو بکات، بالوول ئاوڕی دایەوەو وتی: بۆم دەرکەوت تۆ نە ئادابی نانخواردن دەزانیت، نە ئادابی قسەکردن، ئیدی چیت لە من دەوێت؟

قوتابییەکانی کە بینیان ڕوخساری مامۆستاکەیان زۆر تێکچووە، وتیان مامۆستا بینیت کە ئەم پیاوە شێتە، ئیدی لەوە زیاتر چاوەڕوانی چی لێ دەکەیت؟

شێخ جونەید وتی: پێویستە گوێ بۆ قسەکانی ڕادێرین، شێخ جونەید بە دوای بالوولی حەکیمدا ڕۆیشت، بەڵام بالوول هەوڵی دا زیاتر دوور بکەوێتەوە، شێخ جونەید دووبارە بانگی کردەوەو وتی: من پێویستم پێتە تکایە.. بالوول گوتی: چ پێویستییەکت بە من هەیە، خۆ تۆ تەنانەت ئادابی نانخواردنو قسەکردنیش نازانیت؟

شێخ جونەید: وتی: من زۆر شت لە تۆوە فێردەبم..

بالوول وتی: باشە ئایا ئادابی خەوتن دەزانیت؟

شێخ جونەید گوتی: بەڵێ، کاتێک نوێژی خەوتنانم کرد، زیکرەکانی خەوتن دەخوێنمو جلی خەو لەبەر دەکەمو سەرم لەسەر زەوی دادەنێمو لەسەر لای ڕاست دەخەوم.. دووبارە بالوولی حەکیم لە قسەکانی شێخ جونەید ڕازی نەبوو، وتی: کەواتە ئادابی خەوتنیش نازانیت.. پاشان دەستی بە ڕۆیشتن کردەوە..

هەندێك لە قوتابییەکانی شێخ جونەید ویستیان لە بالوول بدەنو ئازاری پێ بگەیەنن، بەڵام شێخ جونەید ڕێگەی نەدا، ئەو پیاوێکی ژیربوو، دوابەدوای بالوول ڕۆیشتو وتی: من شێخ جونەیدی بەغدادیم، هیچ نازانم، تکایە فێری ئەو شتەم بکە کە تۆ دەیزانیت لەبەر خودا..

بالوول ڕاوەستاو خەندەیەکی کردو وتی: ئەو کاتەی بانگەشەی زانایيت کرد، من لێت دوورکەوتمەوە، بەڵام کاتێك دانت نا بە نەزانیتدا ئەوا من فێرت ئەکەم..

باڵووڵ لەســەر بەردێك دانیشتو داوای لە شێخ جونەید کرد لەسەر ئەو بەردەی تەنیشــتی دابنیشێت، پاشان وتی: هەموو ئەو شتانەی سەبارەت بە ئادابی نانخواردن باست کردن لاوەکی بوون، بنەمای سەرەکی نانخواردن ئەوەیە کە دەبێت بزانیت، ئایا خواردنەکەت حەڵاڵە، یان نا، چونکە نانی حەرام سەدان ئادابی لەگەڵدا باس بکەیت سودی نییە، چونکە خواردنی حەرام دڵ ڕەش دەکات.

شێخ جونەید بەو وەڵامە زۆر دڵخۆش بوو، وتی: خوای گەورە پاداشتت باتەوە..

پاشــان ســەبارەت بە ئادابی قسەکردن وتی: پێویســتە لە دڵێکی پاكو نییەتێکی بێگەردەوە بێتو قســەکانت بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، نەك هیچ کەســی تر، پاشان لە قسەی بێ هودەو بێ سود دوورکەویتەوە، چونکە قسەی بێ سودو بێ هودە، لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە بەڵاو نەگبەتی بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت ئەو ئادابانەی تۆ باست لێوە کردن، هیچ سودێك بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت..

شــێخ جونەید لەســەر بەردەکە هەڵســاو بە وێنەی قوتابییەك لەسەر ئەژنۆ لە خزمەتی باڵووڵی حەکیمدا دانیشــتو وتی: ئەوەی تۆ فێرت کردم پێش تۆ لە هیچ کەسم نەبیستووە! پاشان دەستی بۆ بە سنگییەوە گرتو وتی: ئێستا ئادابی نووستنم پێ بڵێ؟

باڵووڵ گوتی: ئەوەی تۆ گوتت خاڵە لاوەکییەکانی نووســتن بوو، خاڵی ســەرەکی نووســتن ئەوەیــە کە دڵت خاڵی بکەیتەوە لە خۆشەویســتی دونیاو لە حەســودیو ئیرەیی، لە ڕقوکینە بەرامبەر موســوڵمانان، زیکرو یادی خودا بکەیت تا ئەو کاتەی چاوەکانت دەچێتە خەو..

پاشان باڵووڵ هەستاو شێخ جونەید ویستی دەستەکانی ماچ بکات.. پێی وت: تۆ حەقو ڕاســتیت فێرکردم، داواکارم لە خوای میهرەبان بە باشــترین شــێوە پاداشتت بداتەوە..



# ماسیفرۆش

کەش‌و هەوای کۆشــکی خەلیفە بە تەواوی گۆڕابوو، ڕۆژ ڕۆژی جەژن بوو، خوانی خەلیفە بە چەندەها خواردنی بەتام‌و میوەهات ڕازێنرابووەوە، هەر کەس لەو ڕۆژەدا ڕووی بکردایەتە کۆشکی خەلیفە، بە بینینی خوان‌و ڕازاوەیی کۆشك، دڵخۆش‌و ئاسوودە دەبوو.. لە خواردنە بەتامەکانی خوانی خەلیفە، سکی برسی تێردەکرد.

هارونە ڕەشــید لەســەر تەختی پاشایەتی خۆی دانیشــتبوو، هاوسەرەکەی خاتوو (زوبەیدە) لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو، پێکەوە یاری شەترەنجیان دەکرد، خزمەتکارەکان بەردەوام خوانەکەیان دەڕازاندەوەو خەڵکیش پۆل پۆل دەهاتن بۆ پیرۆزبایی جەژن‌و لەسەر خوانەکە دادەنیشتن‌و نانیان دەخواردو خۆشییەکانی خۆیان دەردەبڕی، کۆشك ئەوەندە قەرەباڵغ بوو کە کەسێك هەڵدەستا لەسەر خوان، دەستبەجێ کەسێکی دیکە لە شوێنەکەیدا دادەنیشت..

لەو کاتەدا باڵوولیش وەکو هەر هاوڵاتییەکی ئاســایی، بۆ پیرۆزبایی جەژن هاتە نێو کۆشــکەوە، خەلیفە هارون داوای لێکرد کە لەســەر خوانەکە دابنیشێ‌و نانبخوات، بەڵام باڵوولی حەکیم، ڕەتیکردەوەو لە لایەکی میوانخانەکەی کۆشکدا دانیشت..

لەو کاتەدا دەرگاوانەکە هاتە ژوورەوەو وتی: ماسی فرۆشێك مۆڵەتی هاتنە ژووری دەوێت بۆ لای جەنابتان؟

خەلیفە بەبێئەوەی سەری لەسەر یاری شەترەنجەکەی بەرز بکاتەوە، وتی: ماسی فـرۆش چی دەوێت؟ دەرگاوانەکە وتی: ماسـی فرۆشـەکە ماسـییەکی زۆر گەورەی هێناوە، دەیەوێت پێشکەشی بەڕێزتانی بکات.. خەلیفە هارون مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی بە ماسی فرۆش دا..

کاتێك ماسـی فرۆش هاتە ژوورەوە بۆ لای خەلیفەو ماسـییەکەی پێشکەش کرد، خەلیفە بە گەورەییو ناوازەیی ماسـییەکە زۆر سەرسـام بوو، بەشـێوەیەك هەرگیز پێشتر ماسی لەو جۆرەی نەدیتبوو.. فەرمانی کرد چوار هەزار درهەم بدەن بە ماسی فرۆشـەکە.. ماسی فرۆش چوار هەزار درهەمی وەرگرتو کۆشکی بەجێهێشت، خاتوو زوبەیدە ڕەخنەی لەو بڕیارەی خەلیفە گرتو وتی: هەسـت ناکەیت ئەو بڕە پارەی بەخشیت بە ماسی فرۆشەکە زۆر زۆرە؟

خەلیفـە هـارون سـەیرێکی خاتـوو زوبەیدەی کـردو وتی: بۆچـی ڕەخنە لە بەخشینەکانمان دەگریت؟

خاتوو زوبەیدە: ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی جەژنن، خەڵکانێکی زۆر، سەرکردەو لایەنگرانی دەوڵـەتو ڕێبـواران دێن بۆ لاتو چاویان لەماڵو بەخشـینی تۆیـە، دەبێت پێیان ببەخشـیت، ئەگەر تۆ ئەو ئەندازەیە ببەخشی بە ماسی فرۆشـێك، کەواتە نابێت بە هیچ کام لەوانی دیکە لەو بڕە کەمتر ببەخشـیت، ئەگەرنا ئەوان دەڵێن خەلیفە تەنانەت نرخی ماسی فرۆشێکیشی بۆ ئێمە دانەنا، وەڵامەکەی خاتوو زوبەیدە بیری خەلیفەی سـەرقاڵ کرد، چونکە قسەکەی خاتوو زوبەیدە واقیعی بوو، بەردەوام ئەو قسەیەی لە بیری خۆیدا لێکدەدایەوە، خۆئەگەر ئەمڕۆ هەر کەس سەردانی خەلیفە بکاتو ئەو ئەندازەیەی پێببەخشێ، لە خەزێنەی خەلیفەدا هیچ شتێك نامێنێتەوە!

خەلیفە بۆچوونەکەی زوبەیدەی بە تەواوی بەلاوە پەسەندبوو، بەڵام نەیدەزانی چـی بـکات، هەر بۆیە بە خاتـوو زوبەیدەی گوت: چۆنو بە چ شـێوەیەك ئەو بڕە

پارەیــە وەربگرینــەوە، لە کاتێکدا تۆ دەزانیت ئەو کارە، واتە پەشــیمان بوونەوە لە بڕیارو بەخشینمان، زیان بەناوبانگو شۆرەتمان دەگەیەنێت؟

خاتوو زوبەیدە کەمێك بیری کردەوەو وتی: بانگی ماسی فرۆشەکە بکە، پرسیاری لێ بکە، ئەو ماسییە نێرە، یان مێ.. خەلیفە هارون وتی: باشە ئەگەر وەڵامی دایەوە نێرە، یان مێ، چ سودێك بە ئێمە دەگەیەنێت؟

خاتوو زوبەیدە گوتی: ئەگەر وتی نێرە بڵێ، حەزم لە ماســی نێر نییە، ئەگەر وتیشــی مێیــە بڵێ حەزم لە ماســی مێیە نییە! بەو بەهانەیــە دەتوانی پارەکەی لێوەرگریتــەوە! لەو کاتەدا باڵووڵ کە گوێبیســتی ئــەو وتوێژە بوو، وتی: جەنابی خەلیفە واز لە ماســی فرۆشــەکە بهێنە، هەوڵ مەدەن بەو قسانە فێڵی لێ بکەن! خەلیفە گوێی بۆ قســەی باڵووڵ نەگرت، چونکە ڕێــزی زۆری لە خاتوو زوبەیدە دەگرتو بۆچوونەکانی بەلاوە پەســەندبوو.. فەرمانی کرد ماســی فرۆشــەکەی بۆ بانگ بکەن..

ماســی فرۆش لە خۆشــیدا گەیشــتبووەوە ماڵەوە، لە خۆشــی ئەو هەموو پارەی دەســتی کەوتبوو، زۆردڵخۆشــبوو، لە بیــری ئەوەدا بوو کە چی بــکات بەو هەموو پارەیــە.. لەو ســاتەدا لــە دەرگا دراو پێیان ڕاگەیاند کە جەنابــی خەلیفە فەرمانی کردووە بگەڕێیتەوە بۆ کۆشــك.. ماســی فرۆش بەڕێکەوت بەرەو کۆشــكو ڕۆیشــتە بەردەمی خەلیفەو خاتوو زوبەیدە.. خەلیفە وتی: خاتوو زوبەیدە پرسیارێکی هەیە، ئایا ئەو ماسییە نێرە، یان مێیە؟

ماســی فرۆشەکە زەردەخەنەیەکی کردو بەو پرسیارە سەرسام بوو، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: ئایا دەبێت کەسێك هەبێت بزانێت ماسی نێرو مێ لە یەکتر جیابکاتەوە!!

لــەو ســاتەدا باڵووڵ لێی نزیك بووەوەو بە گوێیدا چپەیەکی کرد، پاشــان ماســی فرۆشەکە وەڵامی دایەوە: ئەو ماسییە نە نێرە نە مێیە، ئەو ماسییە دووڕەگە! خەلیفە بە وەڵامی ماسی فرۆشەکە سەرسام بوو، بۆئەوەی خاتوو زوبەیدە لەو هەڵوێستە ڕزگار بکات، وتی: ئافەرین بۆ وەڵامەکەت، فەرمانی کرد چوار هەزار درهەمی تری پێ بدەن..

پاشان ماسی فرۆشەکە داوای مۆڵەتی ڕۆیشتنی کرد، خەلیفەش مۆڵەتی ڕۆیشتنی پێدا..

ماسی فرۆشەکە بەو هەموو پارەیەوە ڕۆیشتە دەرەوە، لەو کاتەدا درهەمێکی لێکەوتە خوارەوە، داهاتەوەو درهەمەکەی هەڵگرتەوە، زوبەیدە چاوی لێبوو، بە هاوسەرەکەی گوت: تەماشای چاوچنۆکی ماسی فرۆشەکە بکە، هەشت هەزار درهەمی وەرگرتووە، ناتوانێت چاوپۆشی لە یەك درهەمی خۆی بکات، هارون جارێکی دیکە فەرمانی کرد، ماسی فرۆشەکە بانگ بکەنەوە، بۆئەوەی هەموو ئەو درهەمانەی لە دەستیدایە لێی وەرگرێتەوە.. دووبارە بالۆوڵ وتی: واز لە ماسی فرۆشەکە بهێنن بابڕوات، دیسانەوە خەلیفە گوێی بۆ بۆچوونەکەی بالۆوڵ نەگرت.. واخۆی نیشاندا کە هەر گوێی لە قسەکەی بالۆولی حەکیم نەبووە، کاتێك ماسی فرۆشەکە گەڕایەوە، خەلیفە بە تووڕەییەوە پێی گوت: هەشت هەزار درهەمت لەدەستدایە، تەنها یەك درهەمت لێکەوت داهاتیتەوە درهەمەکەت هەڵگرتەوە.. ماسی فرۆشەکە زانی کە خەلیفە دەیەوێت بە هەر بیانوویەك بێت ئەوەی پێی بەخشیوە لێی وەرگرێتەوە، وتی: من ویستم بەو کارەم نیشانی بدەم کە ڕێز لە جەنابی خەلیفە دەگرم، لەبەرئەوەی ڕوویەکی درهەمەکە ئایەتێکی قورئانی پیرۆزەو ڕووەکەی تریشی ناوی بەڕێز جەنابی خەلیفەیە، ئەگەر هەڵم نەگرتایەتەوە دەکەوتە ژێر پێوە، ئەوەش هەم سووکایەتییە بە قورئانی پیرۆز، هەم سووکایەتییە بە ناوی خەلیفە بڕواتە ژێر پێوە..

هارون ئەوەندەی دیکە سەرسام بوو بە وەڵامی ماسی فرۆشەکە، هەربۆیە فەرمانی کرد چوار هەزار درهەمی دیکەی پێ بدەن.. پاشان لەسەر کورسییەکەی هەڵساو بە بالۆولی دانای گوت: خەڵکی بە تۆ دەڵێن: شێت، بەڵام ئەو کەسە شێتە کە تۆ ئامۆژگاری دەکەیت بەوەی کە واز لە ماسی فرۆشەکە بهێنێت، بەڵام بە قسەی نەکردیت، لە بری ئامۆژگاری تۆ، گوێڕایەڵی ئەم خاتوونە بوو..

ڕۆژێکیـــان بالۆولی حەکیم بە یەکێك لە گەڕەکەکانی شـــاری بەغدادا تێدەپەڕی، چاوی کەوت بە پیاوێکی نامۆ، کە بە «ڕێبوار دەچوو»، زۆر بە حەسرەتەوە دەگریا..

بالۆول هەڵوێستەیەکی کردو لێی پرسی: بۆچی بەو شێوەیە دەگری؟

ڕێبوارەکە وتی: پرسیارم لێ مەکە با برینم نەکولێتەوە، پەنا دەگرم بە خودا لە ستەمی هەندێك کەس کە ستەمیان لێکردووم..

بالۆول دەستی خستە سەرشانی پیاوەکەو وتی: پەنای هەموومان خودای گەورەیە، بەڵام تۆ پێم بڵێ، هۆکاری ئەم گریانو بێتاقەتییەت چییە؟

دوای ئـــەوەی بالۆولی حەکیم پێداگری کرد بـــۆ زانینی هۆکاری گریانەکەی، بەو هیوایەی چارەســـەرێکی بۆ بدۆزێتەوە، کابرا چیرۆکەکەی بەم شێوەیە بۆ گێڕایەوە: ماوەیەك لەمەوبەر بەمەبەستی گەشتکردن، ویستم بڕۆمە دەرەوەی شار، لەبەرئەوە ترسام کە پارەو سامانەکەم لە ماڵ جێبهێڵم، لە ترسی دزینو لەناوچوون، لەبەرئەوە پارەو ســـامانەکەم خســـتە نێو کیســـەیەکەوەو بردم بۆ بازاڕ، بۆئـــەوەی لای دوکانی بۆنفرۆشەکە بە ئەمانەت دایبنێم، تا هەم دڵو خەیاڵم لای نەبێت، هەمیش لە دزیو فەوتان بیپارێزم.. ئێستا کە گەڕاومەتەوە دوکاندارەکە نکوڵی لە ئەمانەتەکە دەکاتو دەڵێت: شتی وام لانییەو تۆ بوختانم بۆ هەڵدەبەستی!!

ڕێبوارەکـــە بەدەم گێڕانەوەی قســـەکانی فرمێســـکی هەڵدەوەراند، بە دەســـڕێك فرمێســـکەکانی دەسڕی، سیماو ڕوخســـاری لە پیاو باشـــان دەچوو، بالۆول دڵنەوایی دایـــەوەو پێـــی گوت: بە ویســـتی خـــودا من دەتوانـــم زۆر بە ئاســـانی مافەکەت بۆ بگێڕمەوە.. ئیدی خەم مەخۆ..

بۆ ئەم مەبەســـتە بالۆول ناونیشانی دوکانی بۆنفرۆشـــەکەی لێوەرگرت، دواتر پێی گـــوت: من بەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەڵاتن دەڕۆم بۆ دوکانی بۆنفرۆشـــەکە، تۆش پێش خۆرهەڵاتن لەوێ ئامادەبە..

ڕێبوارەکە پرسی: من چی بڵێمو چی بکەم؟

بالۆول: وتی: کاتێك گەیشـــتیتە دووکانەکە هیچ قسەیەك لەگەڵ مندا مەکە، هەروەکو

ئەوەی کە تۆ من ناناسیت، بە دووکاندارەکە بڵێ هاتووم ئەمانەتەکەم بدیتەوە.. بەمشێوەیە ماڵئاواییان لە یەکدی کرد.

بۆ سبەینێ، هەر بەو شێوەیەی بالووڵ پلانی بۆ دانابوو، بالووڵ پێش خۆرهەڵاتن گەیشـــتە دووکانی بۆنفرۆشـــەکە، پێی گوت: من بە نیازم سەفەر بکەم بۆ خۆراسان.. بۆنفرۆشەکە دەیویست بە خێرایی لە نیازی بالووڵ تێبگات، هەر بۆیە هیوای خواست کە سەفەرێکی خۆشو سەرکەوتوو ئەنجام بدات..

بالووڵ: منیش ئاواتەخوازم ســـەفەرێکی خۆش بێت، بەڵام شتێك هەیە زۆر دوودڵی کردوم، هەرئەوەش وایکردووە بێمە لای بەڕێزتان، بۆنفرۆشـــەکە وا خۆی دەرخست کە پەرۆشـــییەتیو دەیەوێت هەڵوێســـتێکی هەبێتو یارمەتی بدات، پرســـی چی نیگەرانی کردویت قوربان؟

بالووڵ وتی: برێك مرواریو زێڕم هەیە، بە بەهای نزیکەی «٣٠» دیناری ئاڵتون، دەمەوێـــت لای کەســـێکی ئەمیـــن دایبنێم، تـــا کاتێك لە ســـەفەرەکەم گەڕامەوە، بە سەلامەتی ئەمانەتەکەم بۆ بگێڕێتەوە..

بۆنفرۆشـــەکە وا خۆی دەردەخســـت کـــە ســـەرقاڵە، کەلوپەلی دەگواســـتەوە لە شـــوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، وا خۆی نیشـــان دەدا کە زۆر گوێ بەو ماڵو سامانە نادات و بە لایەوە گرنگ نییە، بەڵام بالووڵ زۆر بە باشی چاودێری هەموو جوڵەیەکی بۆنفرۆشەکەی دەکرد، دەیزانی کە هەموو هۆشو بیری لای کیسە پڕ لە مرواریەکەیە.. کە لە ڕاســـتیدا کیســـەیەکی خەیاڵییە. بالووڵ وتی: من لە خەڵکی شار زۆر پرسیارم کرد سەبارەت بە کەسێکی دەستپاکو باوەڕپێکراو، تۆیان نیشاندام، لەبەرئەوە منیش هاتووم تا ئەم کیسەیە بە ئەمانەت لای تۆ دابنێم..

بۆنفرۆش لە خۆشـــیدا قسەی بۆ نەدەکرا، بەڵام هەوڵی دەدا کۆنترۆڵی خۆی بکات، وتی: هیوادارم شوێنی گومانی باشی ئێوە بم..

لەو کاتەدا بالووڵ ســـەیری دەرەوەی دووکانەکەی کرد، بینی وا ڕێبوارەکە بەرەو دووکانەکە دێت، بالووڵ کیســـەکەی دەرهێناو لەبەردەمی دووکاندارەکە داینا، کاتێك

دووکاندارەکە چاوی بە کیسەکە کەوت، خەریکبوو لە خۆشیدا چاوی دەفڕی..

بەڵام ئازیزانم، ناوکیسەکە جگە لە وردە شوشەو لم هیچ مرواریو زێڕێکی تێدا نەبوو، لەو کاتەدا ڕێبوارەکە خۆی کرد بە ژووراو پاش سڵاو وتی: هاتووم بۆ ئەوەی ئەمانەتەکەم بدەیتەوە..

بۆنفرۆشەکە ترسا لەوەی دەستەکەی ئاشکرا ببێت، چونکە بە حسابی خۆی ئەو کیسەیەی ڕێبوارەکە لە چاو ئەم هەموو مرواریيەدا هەر هیچ نییە، لەبەرئەوە بە شاگردەکەی گوت: ئەمانەتی ئەم پیاوە لە فڵانە شوێن دامناوە، خێرا بڕۆ بۆی بهێنە..

ڕێبوارەکە کیسە پارەکەی خۆی وەرگرتەوەو لە دووکانەکە چووە دەرەوە، دوای کەمێك باڵوولیش ماڵئاوایی کردو لە دووکانەکە چووە دەرەوە..

کاتێك بۆنفرۆشەکە دڵنیابوو لەوەی کە باڵووڵ بە تەواوی لە دووکانەکە دوورکەوتۆتەوە.. کیسەکەی بەرز کردەوەو لەسەر مێزەکە داینا، لەو کاتەدا شاگردەکەی سەیری دەکرد، کاتێك بۆنفرۆشەکە هەستیکرد شاگردەکەی سەیری دەکات هاواری کرد بەسەریاو پێی گوت: بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە.. لە خۆشیدا چاوی پڕبوو لە فرمێسك، کیسەکەی کردەوەو بینی جگە لە لمو وردە شوشە، هیچ شتێکی دیکەی تێدا نییە....!!!

خۆشەویستان دەبێت بۆنفرۆشەکە چی بەسەر هاتبێت، کاتێك ناو کیسەکەی بینیوە کە پڕە لە لمو وردە شوشە؟؟؟!!!

بەم شێوەیە حەکیم ماڵوسامانەکەی کاکی ڕێبواری لە فەوتانو تیاچوون ڕزگار کردو خەندەی ڕێبواری کردە شادیو پێکەنین، شادی ستەمکاریشی کردە خەمو پەژارە!



# باڵووڵ و قازی

ڕۆژێکیان پیاوێك لە شاری بەغداد ڕووی کردە دادگاو لە لای قازی لەسەر کەسێك کە ستەمی لێکردبوو سکاڵای تۆمار کرد..

قازی پرسیاری لە سکاڵاکار کرد: کە ڕووداوەکە چۆن ڕوویداوە؟

سکاڵاکار: دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی ستەملێکردنەکەی، پاش تەواوبوونی قسەکانی، قازی بۆی دەرکەوت کە ستەمکارەکە یەکێکە لە هاوڕێو دۆستە نزیکەکانی..

لەبەرخۆیەوە وتی: چ کارەساتێکە هاوڕێکەم کەوتۆتە ناو ئەم کێشەیەوە!!

لەبەرئەوە قازی بیری لە چارەسەرێکی گونجاو دەکردەوە، تا بتوانێت بەو هۆیەوە سکاڵاکار لە داواکەی بێ هیوا بکات..

هەربۆیە لێی پرسی: ئایا بۆ ڕاستی قسەکانت شاهیدت هەیە؟

سکاڵاکار وتی: بەڵێ شاهیدم هەیە.. قازی وتی: شاهیدەکەت کێیە؟

سکاڵاکار: جەنابی باڵووڵ شاهیدەو ئاگای لە ڕووداوەکە بوو..

بە بیستنی ناوی باڵووڵ قازی ڕەنگی تێکچوو، چونکە زۆرباش باڵووڵی دەناسیو دەیزانی چەندە ژیرو دانایە..

بەڵام جەنابی قازی جگە لە داواکردن بۆ ئامادەبوونی بالووڵ لە دادگا، چارەیەکی دیکەی نەبوو..

کاتێك سـکاڵاکار ڕۆیشـت بە دوای بالووڵدا، قازی بە تەنها مایەوە، لەبەرخۆیەوە وتی: ئەگەر بالووڵ هات، دەبێت چەند پرسـیارێکی ئاڕاستەبکەم، کە هیچ پەیوەندی بە سکاڵاکەوە نەبێت، بۆئەوەی بێزار ببێتو بڕواتە دەرەوە..

دوای کاتژمێرێك سـکاڵاکار گەڕایەوە نێو دادگاو جەنابی بالووڵیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، کاتێك قازی چاوی بەم دوو کەسە کەوت، کەمێك کۆکیو پاشان بە بالووڵی گوت: ئایا شایەتی دەدەیت لەسەر ئەم سکاڵایە؟

بالووڵ سەیرێکی قازی کردو گوتی: بەڵێ..

قازی کەمێك بیری کردەوەو وتی: ئایا قورئانت لەبەرە؟

بالووڵ: بەڵێ هەموو قورئانی پیرۆزم لەبەرە..

پاشان پرسی: ئایا ئەحکامە شەرعییەکان دەزانیت؟

بالووڵ: زیاتر لە پێویست شارەزای ئەحکامە شەرعییەکانم..

پاشان قازی وتی: ئایا هیچ کات مردووت شۆردووە؟

بالووڵ بە خەندەوە وتی: لەسەر ئەوە ڕاهاتووم، ئەوەکاری باووباپیرانیشم بووە!

پاشان قازی ئەوەی لەبەردەستیدا بوو کۆی کردەوەو پرسی: ئایا کاتێك جەنازەیەکت شۆردووەو خستوتە نێو گۆڕەوە، چیت پێ وتوە؟

بالووڵ لە وەڵامدا وتی: پێم گوتوە ئەم مردنەت پیرۆزبێت، چونکە وەکو شـاهید لەبەردەم قازییەکی وەکو تۆدا ئامادە نەبووە!!

بە بیستنی ئەم قسەیە قازی ڕەنگی ڕوخساری گۆڕا، زانی کە خۆدزینەوە لە دەستی زانایی‌و دانایی بالووڵ ئاسـتەمە، چارەیەکی دیکەی نەبوو، جگە لە پەسـەندکردنی شایەتییەکەی بالووڵی حەکیم..

بەڵێ خۆشەویسـتان، بالووڵی داناو حەکیم بە ویقارو سەکینەتو داناییەکەیەوە، مافەکەی گێڕایەوە بۆ کەسی ستەملێکراو.

# بالۆول و بەرپرسیاریتی مشکەکان

بەسەرهاتێکی دیکە لە بەسەرهاتە دەگمەنەکانی بالۆولی حەکیم کە پەیوەستە بە دادوەریو بەرگریکردن لە ستەملێکراوان: ساڵێک یەکێك لە بازرگانەکانی شاری بەغداد بە مەبەستی بە جێهێنانی فەریزەی حەج، ڕۆیشت بۆ شاری مەککەی پیرۆز، لە پێش ڕۆیشتنیدا کیسەیەك دراوی زێڕی هەبوو سپاردی بە قازی شار، چونکە لە دەستپاکی قازی دڵنیابوو..

دوای تەواوبوونی فەریزەی حەج، بازرگانەکە گەڕایەوە، چەند ڕۆژێك پاش گەڕانەوەی ڕۆیشت بۆ لای جەنابی قازی بە مەبەستی وەرگرتنەوەی ئەمانەتەکەی.. بەڵام قازی داوای لێبوردنی لێکردو پێی ڕاگەیاند کە کیسە دراوەکەی مشك خواردوویەتی!

بازرگان لە تاویماڵو سامانەکەی دەستیکردە گریان، جگە لە هەڵوەرانی ئەسرینی چاوەکانی چارەیەکی دیکەی نەبوو، چونکە نەدەسەڵاتی بەسەر قازیدا هەبوو، نەدەیتوانی بە قازی بڵێ باوەڕ بە قسەکانت ناکەم، لەو کاتەدا باڵووڵ بەلای بازرگانەکەدا تێپەڕی، کاتێك بینی بازرگان زۆر بە کوڵ دەگریو خەم دەخوات، لێی نزیك بووەوەو لە هۆکاری گریانەکەی پرسیاری کرد.. بازرگانیش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە..

باڵووڵی حەکیم پێی گوت خەم مەخۆ، بە پشتیوانی خودا سبەینێ ماڵو سامانەکەت بۆ وەردەگرمەوە.. باڵووڵ بازرگانی جێهێشتو ڕۆیشت بۆ لای خەلیفە هارونە ڕەشید.. پێی گوت: فلان بەرپرسیارێتیت دا بە فیسار کەسو فلان کەست کرد بە بەرپرسیاری فلان شتو.. هتد، خەلیفە پرسی تۆ چیت دەوێ؟

باڵووڵ گوتی: دەمەوێت ببمە بەرپرسی مشکەکانی شار!

خەلیفە هەرچەندە داواکەی لاسەیربوو، بەڵام دەیزانی کە باڵووڵ بێ حیکمەت ئەو داوایە ناکات، هەربۆیە وتی: باشە ئەوە تۆ بەرپرسی مشکەکانی ناو شاری!

باڵووڵ گوتی: بەو شێوەیە نابێت، پێویستە فەرمانم بۆ دەربکەیتو بە فەرمی ئەو پۆستەم پێببەخشیو چەند پاسەوانێکم بۆ دابنێیتو چەند کەسێکیش بە دەفەوە لەگەڵمدا بن..

خەلیفە هەر بەو شێوەیەی کە باڵووڵ خواستی بوو، فەرمانی بۆ دەرکرد، باڵووڵ سواری ئەسپەکەی بوو، چەند پاسەوانێك بەدوایەوە بوونو چەند کەسێکیش بە دەف لێدانەوە بەدوایدا ڕۆیشتن، کەس لەوان نەیدەزانی باڵووڵ مەبەستی چییەو بۆ کوێ دەچێت.. خەڵکی بە بینینی ئەو دیمەنە پێدەکەنینو گاڵتەیان پێدەهات.. باڵووڵ

بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تا گەیشتە ماڵی قازی، فەرمانی بە دارودەستەکەی کرد کە چاڵێك لە ژێر دیواری ماڵی قازیدا هەڵبکەنن، قازی بە دەنگی دەفو پاسەوانەکانی باڵووڵ هاتەدەرەوە، کاتێك باڵووڵی بینی، پرسی: ئەوە چی دەکەیت، باڵووڵ؟

باڵووڵ گوتی: ئایا من لێپرسراوی مشکەکان نیم؟ مشکێك لیرەیەکی ئاڵتونی خواردووەو خۆی کردووە بە ژێر ئەم دیوارەی ماڵی تۆدا.. منیش دەمەوێت دەستگیری بکەم!

قازی وتی: باڵووڵ چۆن مشك لیرە دەخوات؟

باڵووڵ لە وەڵامدا گوتی: هەروەکو چۆن مشکەکانی ئێوە دراوە ئاڵتونییەکانی بازرگانەکەی خوارد، هەر بەو شێوەیەش لیرە ئاڵتونییەکەی منی خواردووە!

جا تۆش، یان دراوە ئاڵتوونییەکانی ئەم بازرگانە بگێڕەوە، یان من ماڵەکەی تۆ دەڕوخێنم تا مشکەکە دەستگیر بکەم..

قازی بە ناچاری ئەمانەتەکەی گێڕایەوە بۆ بازرگانەکە!

جەنابی حەکیم هەمیشە لە خەمی چارەسەری گرفتو کێشەی خەڵکیدا بووە، لەبەرئەوە هەموو کات بە بیری تیژو بیرۆکەی ناوازە، چارەسەری گرفتەکانی کردووە، بۆ سەرخستنی ستەملێکراوان، هەموو تواناکانی خستۆتە کارو بەردەوام پشتیوانی لە بێ نەوایانو هەژاران کردووە، حەکیم بە درێژایی ژیانی دژ بە ستەمکارو دەسەڵاتداران، لە سەنگەری ستەملێکراواندا بووە!

# باڵووڵ

# ئێسترێک فێری خوێندنەوە دەکات



زۆرجـار خەڵکی شـارەکانی دەوروبەر دەهاتن بۆ سـەردانی فەرمانڕەوای شـاری کوفـەو دیاری جوانو بە نرخیان بۆ دەهێنا، ڕۆژێکیان پیاوێك هات بۆ شـاری کوفە ئێسترێکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، بەرەو کۆشکی فەرمانڕەوا بەڕێکەوت، تا دیارییەکەی پێشکەشـی فەرمانـڕەوای کوفە بکات، هاوکات ئەو ڕۆژە جـەژن بوو، گەورە پیاوانی شاری کوفە بۆ پیرۆزبایی جەژن هاتبوون بۆ لای جەنابی فەرمانڕەوا، بینیان پیاوێك جڵەوی ئێسـترەکەی گرتووەو بەرەو کۆشـك دێت، دیمەنەکە سەرنجی ئامادەبووانی ڕاکێشا، هەمووان دەستیان کرد بە پێکەنینو گاڵتەپێکردنی ئێسترەکەو خاوەنەکەی، هـەر یەك لەوان بەشـێوەیەك توانجی لەو دیارییە دەدا، کـە بۆ فەرمانڕەوا هاتبوو، زۆریان بە ناڕاستەوخۆ توانجیان لە جەنابی فەرمانڕەوا دەدا، تا جەنابی فەرمانڕەوا بە تەواوی قەڵسو تووڕەبوو، بۆ هەر یەك لەوان لە کەمیندا بوو، چاوەڕێی هەلێکی گونجاوی دەکرد، بۆ ئەوەی تووڕەبوونی خۆی بەسەریاندا خاڵی بکاتەوە.

لـەو کاتەدا یەکێـك لە ئامادەبـووان بـە گاڵتەجاڕییەوە وتی: ئەگـەر جەنابی فەرمانڕەوا مۆڵەتم بدات، ئەم ئێسترە فێری خوێندەواری دەکەم، کاتێك فەرمانڕەوا گوێی لەو قسـەیە بوو، جامی تووڕەبوونی خۆی بەسـەردا ڕژاندو بەسەریدا هاواری کرد، دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات، دەزانیت دەڵێی چی؟

بێگومان دەبێت ئەو قسـەیەت بسـەلمێنیت، بێدەنگی باڵی بەسەر ئامادەبووواندا کێشـا، ئامادەبـووان زانییان دوای تووڕەبوونی فەرمانـڕەوا بوارێك بۆ گاڵتەو گەپو پێکەنیـن نامێنێتەوە، ترسو بیم باڵی بەسـەر ئامادەبوواندا کێشـا، بەتایبەت ئەو کەسەی گوتی: ئێسترەکە فێری خوێندەواری دەکەم!!

فەرمانڕەوا لە ناخەوە دڵخۆشـبوو بە بێدەنگبوونو ترسـانی ئامادەبووان، کاتێك بینی تووڕەبوونەکەی کاریگەری زۆری کردووەتە سەر ئامادەبووان، پاشان بەو پیاوەی گـوت: ئەگەر توانیت ئەو ئێسـترە فێری خوێندەواری بکەیـت، ئەوا لەلایەن منەوە خەڵاتێکی گەورە دەکرێیت، خۆئەگەر نەتتوانی ئەوە فەرمان دەکەم بتکوژن!

هەرچەندە پیاوەکە زۆر پەشیمان بووەوە لە قسەکانی، بەڵام سوودی نەبوو، دواتر ویستی بێدەنگی کۆڕەکە بشکێنێت، وتی: جەنابی فەرمانڕەوا پێویستە چەند ڕۆژێك مۆڵەتم بدەیت بۆ ئەو کارە!

فەرمانڕەوا دەستێکی بە سمێڵیدا هێناو وتی: پێویستت بە چەند ڕۆژ هەیە؟

پیاوەکە کە نەیدەزانی چی دەڵێت، وتی: تەنها (١٠) ڕۆژ.

فەرمانــڕەوا مۆڵەتــی (١٠) ڕۆژی پێــدا، پیاوەکــە زۆر بــە خەمبارییەوە جڵەوی ئێســترەکەی گــرتو بەرەو مــاڵ کەوتە ڕێ، ئەو کــە نەیدەزانی چ چارەنووســێکی ڕەش چاوەڕێــی دەکات.. لــە ماڵــەوە چاوەڕێیان دەکرد تا بــە دیارییەکی بە نرخی جەنابی پاشــاوە بگەڕێتەوە، بەڵام کاتێك گەیشتەوە ماڵو هەواڵەکەی بۆ خێزانەکەی گێڕایەوە، خێزانەکەی قیژاندی بەسەریداو هەرچی لەبەردەستی دابوو، گرتییە سەری هاوسەرەکەیو دواتر لە ماڵ دەری کردە دەرەوە..

پیــاوە هەژارو بەســەزمانەکە، نەیدەزانی چی بــکاتو ڕوو لە کوێ بکات، جڵەوی ئێســترەکەی بەدەستەوە گرتو بەناو کۆڵانەکانی شــاری کوفەدا دەسوڕایەوەو لەبەر خۆیەوە دەیگوت: هەرچی بەســەرم هات بە هۆی نەزانی خۆمەوە بوو، ئێستا دەبێت من چی بکەم، ئای من چەند هەژارو بەسەزمانم!!

لــەو کاتــەدا بە تەنیشــتی باڵووڵی حەکیمدا گوزەری کرد، کە لەســەر ســەکۆی مزگەوتەکە دانیشتبوو، باڵووڵ کاتێك ئەو پیاوەی بینی دەڕواتو دەگریو لەبەرخۆیەوە قسە دەکات، پرسیاری لێکرد خاڵۆ ئەوە چیتە، بۆ وات بەسەرهاتووە؟

ئەویش تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، باڵووڵی حەکیم گوتی: خەم مەخۆ من ڕێگەیەکت فێردەکەم کە لەو گرفتە ڕزگارت ببێت!

پیاوەکە کە هەموو پێشنیارێکی قبوڵ بوو، بەپەرۆشەوە پرسی، ئێستا دەبێت من چی بکەم؟!

باڵووڵی حەکیم گوتی: زۆرباش گوێ بگرە بۆ ئەو قسانەی من پێت دەڵێم، ئەمڕۆ ئێسترەکە برسی بکەو هیچ جۆرە خۆراکێکی پێ مەدە، لە سبەینێوە دەست پێ بکەو

تــا «١٠» ڕۆژ بەردەوام بە، چەند دەنکە جۆیەك بخەرە نێوان پەڕەکانی کتێبێکەوە، پاشان کتێبەکە نیشانی ئێسترەکە بدەو پەڕەکانی بۆ هەڵدەرەوە، ئێسترەکە بە زمانی دەنکە جۆکان هەڵدەگرێتەوە، چونکە برســییەتیو عەوداڵــی خواردنە، ئەگەر ئەو کارەت بۆ ماوەی «١٠» ڕۆژ دووبارە کردەوە، ئێسترەکە فێردەبێت کە بەناو پەڕەکانی کتێبدا بگەڕێتو پەڕەکانی هەڵبداتەوە بە مەبەســتی دۆزینەوەی خۆراك، پاشان ئەو ڕۆژەی کە دەڕۆیت بۆ لای فەرمانڕەوا خواردن بە ئێسترەکەت مەدە با برسی بێت!

پیاوەکە زۆر دڵخۆشــبوو، بەو پێشــنیارەی باڵووڵی حەکیمو لەو بڕوایەدا بوو، کە ئەوە دەبێتە هۆی ڕزگاربوونی لەو گرفتە، زۆر سوپاسی باڵووڵی حەکیمی کردو دواتر ماڵاوایــی کــردو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بەو هیوایەی قەناعــەت بە خێزانەکەی بکات، کــە ئەو دە ڕۆژە مۆڵەتی بــدات بۆ جێبەجێکردنی پێشــنیارەکەی باڵووڵی حەکیم، کاتێك خێزانەکەی چاوی پێکەوت، دووبارە هاواری کردەوە بەســەریدا، بەڵام کاتێك پێشــنیارەکەی باڵووڵــی حەکیمی بۆ گێڕایەوە ئارام بووەوەو ئەویش پێشــنیارەکەی پەســەند کرد، پاشان دەستیکرد بە جێبەجێکردنی پێشنیارەکەی باڵووڵی حەکیم تا نۆ ڕۆژ بەردەوام بوو، ئێســترەکەی فێرکرد چۆن پەڕاوەکانی کتێبێك هەڵبداتەوە تا دەنکە جۆکانی ناو پەڕەکان هەڵگرێتەوە.

لە ڕۆژی دەیەمدا زۆر بە دڵخۆشــییەوە، جڵەوی ئێســترەکەی گرتو ڕۆیشــت بۆ لای جەنابی فەرمانڕەوا، کاتێك چووە ناو کۆشکەوە، لە کاتێکدا فەرمانڕەواو دەستو پێوەندەکەی لە چاوەڕوانی چارەنووسی ئەو پیاوە هەژارەدا بوون..

بواریان بۆ کردەوەو ئێســترەکەی هێنایە پێشەوەو کابرا بە خۆیو ئێسترەکەیەوە لەبەردەم ئامادەبووواندا ڕاوەســتاو کتێبێکی خســتە بەردەمی ئێسترەکە، «لە کاتێکدا ئێســترەکە زۆر برســی بوو»، ئێســترەکەش وەکو نەریتی چەنــد ڕۆژەی بە هیوای دۆزینــەوەی چەنــد دەنکە جۆیــەك بە زمانی یەکــە یەکەی پەڕەکانــی کتێبەکەی هەڵدەدایەوە، ئێســترەکە تەواوی پەڕەکانی کتێبەکەی هەڵدایەوە، بەڵام ئەمجارەیان

بێ هیوابوو لە دۆزینەوەی دەنکە جۆکان.

ئێسترەکە بە برسێتی مایەوە، بەڵام چۆن خاوەنەکەی تێ بگەیەنێت کە برسییەتی تەنگی پێ هەڵچنیوە؟

ئامادەبـــووان قەناعەتیان کرد کە ئێســـترەکە دەخوێنێتـــەوە، هەربۆیە هەمووان دەســـتیان کـــرد بە چەپڵەلێدان بۆ پیاوە هەژارەکەو سوپاســـییان کـــرد بۆ ئەو کارە ئەستەمەی ئەنجامی داوە..

کاتێك دەنگی چەپڵەو هاوارکردن تەواو بوو، بێدەنگی باڵی بەســـەر ئامادەبووواندا کێشـــا، فەرمانـــڕەوا فەرمانی کـــرد وەکو ڕێزێك خواردن بدەن بە ئێســـترەکە، دواتر ئاوڕی دایەوە بۆ لای پیاوەکەو سوپاســـی کردو وتی: ئێســـتا پێمان بڵێ چۆن توانیت ئەو ئێسترە فێری خوێندەواری بکەیت؟

پیاوەکە کەمێك پێکەنیو پاشان وتی: ڕزگاربوون لە ڕاستگۆییدایە، من دەمەوێت ڕاستی ئەو بابەتەتان پێ بڵێم، بەڵام دەمەوێت سەرەتا ئەمانم پێ بدەیت؟

فەرمانڕەوا گوتی: تۆ لە ئەمان دایت.

ئەویـــش تـــەواوی چیرۆکەکەی بـــۆ گێڕانەوەو وتی: ڕزگاربوونـــی من لەم گرفتە سەختە بەهۆی بیرۆکەو پێشنیاری باڵووڵی حەکیمەوە بوو!

دوای ئەوە فەرمانڕەوا دیارییەکی جوانی پێبەخشـــی، پاشـــان ئاوڕێکی دایەوە بۆ لای ئامادەبووانو گوتی: خۆزگە هەر یەکێك لە ئێمە هێندەی تۆســـقاڵێك لە ژیریو زیرەکیو دانایی، باڵووڵی حەکیمان هەبووایە!

# خوانی نیوەڕۆ

باڵووڵی دانا ئەو کەســەی بە بیری تیژو چارەسەری کێشە سەختەکانو بیرۆکەی ناوازەو داناییو حەکیمی ناسراوە، باڵووڵ کەسێکی حەکیمو لێهاتوو بووە لەسەردەمی خۆیداو لە زۆرێك لە کێشە دژوارەکانداو لەو کاتەی دەوروبەری دەستەوەستانو دۆش دامــاون، حەکیم بە بیرۆکەیەکــی ناوازەو گوتەیەکی بەهێز هاتۆتە مەیدانو زۆر بە ســانایی کێشەکەی چارەســەر کردووە، هەروەها ئامۆژگاریکارو خاوەن ئەزمون بووەو کەسانی دەوروبەری لە هەموو بوارەکاندا سوودیان لە داناییەکەی بینیوەو قسەکانیان بە هەند وەرگرتووە..

لە بەسەرهاتو چیرۆکی ئەمجارەی باڵووڵی حەکیمدا باس لە بیرۆکەیەکی ناوازەی دیکەی دەکەین، ئێستا با پێکەوە ئەم بەسەرهاتە بخوێنینەوە..

فەرمانڕەوای شار لەسەر کێشەیەك لە سەرمای زستاندا، سزایەکی سەختی بەسەر یەکێك لە لاوەکانی شاردا سەپاند، سزاکەش بریتی بوو لەوەی بچێتە ناو ڕووبارێکەوە، دەبێت بەرگەی ســەرماو ســۆڵەی ئاوەکە بگرێت، لە کاتی سەپاندنی سزاکەدا بەسەر ئەو لاوەدا، واتە ئەو کاتەی کوڕەکەیان خستە ناو ڕووبارەکەوە.. دایکی کوڕە لاوەکە لەوبەری ڕووبارەکە ئاگرێکی کردەوە.. دایکەکە دەیزانی کوڕەکەی لەناو ڕووبارو ئاگر لــە کەناری ڕووبار هیچ ســوودێك بە کوڕەکــەی ناگەیەنێت، بەڵام ئاگری جەرگ بە ئازارەو ئەویش شتێکی دیکەی لە دەست نەدەهات..

کوڕەکە لە ناو ڕووبارەکەدا لە سەرمادا هەڵدەلەزری، کاتێك هاتە قەراغی ڕووبارەکەو ویستی بێتە دەرەوە.. جەنابی فەرمانڕەوا وتی: تۆ دایکت ئاگری بۆ کردوویتەوە، لەبەرئەوە لە ڕووبارەکەدا سەرمات نەبووەو بەرگەت گرتووە، دەبێت دووبارە بڕۆیتەوە نێو ڕووبارەکە، لە کاتی دووبارەکردنەوەی سزاکەدا باڵووڵ ئامادەبوو، بەو بڕیارە ستەمکارانە ڕازی نەبوو، هەربۆیە دەستبەجێ بیرۆکەیەکی بە خەیاڵدا هاتو وتی: جەنابی فەرمانڕەواو قازی شارو ئەو کەسانەی لێرە ئامادەن بۆ نانی نیوەڕۆ میوانی من دەبن‌و تەشریف بهێنن بۆ ماڵی ئێمە، ئەوانیش بانگهێشتەکەیان قبوڵ کردو هەمووان بەڕێکەوتن بۆ ماڵی باڵووڵی حەکیم، کاتێك گەیشتنە ماڵی باڵووڵ میوانەکان چاوەڕوانی خوانی ڕازاوەو خواردنی خۆش بوون، کات درەنگ بوو، بەڵام خواردن ئامادە نەبوو، پرسیان بۆ خواردن نەهات، باڵووڵ گوتی: هێشتا پێ نەگەیشتووە، کاتژمێرێك دووان، سییان تێپەڕی، بەڵام خواردن هەرنەهات، سکی برسییان چی دی ئارامی نەماو دووبارە پرسییان بۆ خواردن نەهات، باڵووڵ وتی مەنجەڵەکە لەسەر ئاگرەکەیە، خواردنەکە پێنەگەیشتووە، کات زۆر درەنگ بوو، هێشتا خواردن نەهاتووە، مشتومڕی میوانەکان‌و سکی برسییان لەوە زیاتر ئارامی نەگرتو وتیان کوا ئەو مەنجەڵەی خستووتە سەر ئاگر، نیشانمان بدە، بزانین بۆ ناکوڵێ، باڵووڵ بردنی بۆ لای مەنجەڵەکەو نیشانی دان، بەڵام هەمووان لە هەڵسووکەوتی باڵووڵی حەکیم سەرسام بوون، بینیان لەسەر زەوییەکە ئاگری کردۆتەوەو مەنجەڵەکەی بە نێوان دوو درەختی دارخوما بەبەرزی هەڵواسیوە! هەموو وتیان تۆ شێتی، گاڵتەمان پێدەکەی، مەنجەڵ بەوبەرزییەوە، ئاگر لەو خوارەوە، چۆن ئەو مەنجەڵە گەرم دەکات، چ جای ئەوەی بیکوڵێنێت؟

باڵووڵی حەکیم وتی: باشە ئەو دایکەی لەوبەری ڕووبارەکە ئاگری کردەوە، چۆن کوڕەکەی لەناو ڕووبارەکە گەرمی هاتەوە؟ ئایا ئاگری ئەو دایکە بەهێزترە، یان ئاگری مەنجەڵەکە؟!! بەوشێوەیە فەرمانڕەوا زانی مەبەستی باڵووڵ ئەوەیە کە بڕیارەکەی جەنابیان نادادگەرانەیە!

حەکیـــم جگە لەوەی کەسـێکی بیرتیژو زیرەكو لێهاتوو بــە ئەزموون بووە، لە هەمان کاتدا لە چارەســەری کێشــە دادوەرییەکانیشــدا دەســتێکی باڵای هەبووە، بە جۆرێك کە زۆرێك لەو کێشــانەی دادگای ئەو کات بڕیاری گونجاوی لەبارەوە نەداوە، حەکیم توانیویەتی لە ســاتێکی کەمدا بە سادەترین شێوەو بە جۆرێك کە هەمووان بە بڕیارەکەی ڕازیبن‌و بە شـێوەیەك دادوەرو دادگاشــی سەرســام کــردووەو نەیان توانیوە توانج لەو بڕیارە بدەن، کە باڵوولی حەکیم بۆ چارەسەری کێشەکان بڕیاری لەسەرداوە..

ئــەو کاتەی کە دادوەرەکان‌و فەرمانڕەواکان دەستەوســان دەبوون‌و دۆش دادەمان لە بەردەم کێشــەکاندا، حەکیم بە بیری تیژو زیرەکانەی خۆی، هاتۆتە مەیدان‌و لە چاوترکانێکدا کێشەکەی بۆ چارەسەر کردوون..

لە چیرۆکی ئەمجارەی باڵوولی حەکیمدا باس لە چارەسەری کێشەیەکی دادوەری دەکەین، کە حەکیم زیرەکانە توانیویەتی چارەسەری بکات..

لە سەردەمی حەکیمدا پیاوێکی بەساڵاچوو ماڵئاوایی لە ژیان کرد، ئەم پیاوە خاوەنی دوو کــوڕ بــوو، کوڕەکانی بە کۆچی دوایی باوکیان زۆر نیگــەران‌و خەمباربوون، بەڵام ئەوە ســوونەتی ژیانەو هیچ کەس‌و دەسەڵاتێك ناتوانێت بەرگری لە کۆچی ئەزیزان‌و خۆشەویســتانی بکات، ژیانیش هەروابووە ئەوە ڕاســتییەکی بەڵگە نەویســتە، کە پاش ماوەیەك هەموو ئەو کەسانەی دونیا جێدەهێڵن، کەسووکاریان لە بیریان دەچنەوە، بە ئەندازەیەك کە ڕەنگە تەنانەت لە یادیان نەبێت نزایەکی خێرییان بۆ بکەن..

ئــەم دوو کــوڕەش هەروەکو هەموو کەســانی دیکە پــاش تێپەڕبوونی ماوەیەك بەســەر کۆچی دوایی باوکیاندا، بڕیاریاندا ئەو ماڵەی لە باوکیانەوە بۆیان جێماوە، وەکــو میراتی لە نێوان خۆیاندا دابەشــی بکەن، باوکیان تەنها «٥» ســەر مەڕی لە پاش خۆی جێهێشــتبوو، کاتێك وەســییەتەکەی باوکیان خوێندەوە نوسرابوو نیوەی مەڕەکانی بۆ کوڕە گەورەکەی‌و سێیەکی مەڕەکانیشی بۆ کوڕە بچووکەکەی، ئەوان بە بیســتن‌و خوێندنەوەی ئەم وەسییەتە تووشی شۆکبوون‌و دەستەوسان بوون لە ئاست

دابەشــكردنی میراتییەکە، نەیاندەزانی چۆنو بە چ شــێوەیەك میراتییەکەیان دابەش بکەن، بڕیاریاندا بۆ ئەو مەبەستە بڕۆنە لای قازی شارو داوای چارەسەرێکی گونجاوی لێ بکەن، کاتێك کێشەکەیان بۆ قازی باسکرد، قازی دەستیکرد بە پێکەنینو گوتی: ئەوە زۆر ئاسانە، ئێستا زۆر دادپەروەرانە مەڕەکانتان لە نێواندا دابەش دەکەم، «٣» مەڕ بۆ کوڕە گەورەکەو تەنها مەڕێك بۆ کوڕە بچووکەکە، وتیان ئەی مەڕەکەی تر، قازی گوتی: مەڕەکەی تر بۆ من جێبهێڵن، لە بری ماندووبوونو سەرقاڵ بوونم بە کێشەکەتانەوە..

هیچ کام لە کوڕەکان قەناعەتیان بە بڕیارەکەی قازی شــار نەبوو، لەو ســاتەدا کە ئەوان دۆش دامابوونو نەیاندەزانی چی بکەن، باڵووڵی حەکیم وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی، کە بۆ هەموو شــوێنێکی شــارەکە دەچوو، بە مەبەســتی هاوکاریو یارمەتیدانو چارەسەرکردنی گرفتی هاوڵاتیانی شارەکە، گەیشتە دادگاو بینی کە دوو برا بە خەمباری دانیشتوون، کاتێك ئەوانی بینی، پرسی کە کێشەیان چییە؟ بۆچی واخەمبارن؟

ئەوانیــش چیرۆکەکەیان بــۆ گێڕایەوە، حەکیم گوتی: خەمبــار مەبن ئەوە زۆر ئاســانە، فەرمانــی کرد تا مەڕێکی لە مەڕەکانی خۆی بــۆ بهێنن، کاتێك مەڕەکەیان بۆ هێنا، مەڕەکەی خســتە پاڵ پێنج مەڕەکەی دوو کوڕەکەو گوتی: ئێســتا ژمارەی مــەڕەکان شــەش دانەن، بە کــوڕە گەورەکەی گوت: بەپێی وەســیەتەکەی باوکت تۆ نیــوەی میراتەکــە وەردەگری، بڕۆ نیوەی مــەڕەکان ببە بۆ خۆت، کە دەکاتە ســێ مــەڕ، بــە کوڕە بچووکەکەشــی گوت: تۆش بە پێی وەســیەتەکەی باوکت ســێیەکی میراتییەکە وەردەگری، بڕۆ ســێیەکی مەڕەکان ببە بۆ خۆت، واتە لە هەر ســێ مەڕ یەك مەڕت بەردەکەوێت، لە کۆی شــەش مەڕ دوو مەڕت بەردەکەوێت، ئەو مەڕەش کە دەمێنێتەوە، ئەوە مەڕەکەی خۆمە..

بەم جۆرە حەکیم بێئەوەی ســتەم لە کەســییان بکات، میراتییەکەی بەو شێوەیە بۆ دابەشکردن کە باوکییان وەسییەتی بۆ کردبوون!

هــەردوو براکــەش، بە بڕیارەکــەی حەکیــم زۆر ڕازیبوونو سەرســام بوون بە لێهاتوویيو حیکمەتو دانایی باڵووڵ.

# وەڵامدانەوەی مەتەڵەکانی خەلیفە هاروون

دووبـــارە دەچینەوە قوتابخانەکەی باڵوولی حەکیمو وانەیەکی دیکە لە بیرتیژیو زیرەکی حەکیم دەخەینەڕوو، باڵووڵ هەرگیز بۆ وەڵامی هیچ پرسیارێك دەستەوسان نەبووە، هەموو کات بە وەڵامە دروســتەکانی بەرامبەری سەرســام کردووە، زۆرجار خەلیفە هارون داوای ئامۆژگاری لێکردووەو لە ناخەوە گوێبیســتی ئامۆژگارییەکانی بووە.

حەکیم بە هۆی زیرەکیو لێهاتوویی‌و توانا بێ سنورەکانیو قسە نەستەقەکانییەوە، پلــەو پایەیەکــی تایبەتــی هەبــووە لای خەلیفە هــارون، خەلیفە هــارون مۆڵەتی هەمیشــەیی بە حەکیم بەخشــیوە، بە جۆرێك لە هەر کاتو ساتێك باڵووڵ ئارەزوو بکات، دەتوانێت بەبێ مۆڵەت وەرگرتنو چاوەڕوانی، بڕوات بۆ کۆشــکی خەلیفەو لە تەنیشــتی خەلیفەوە، یان لە هەر شــوێنێك بییەوێت دابنیشێت، ڕۆژێکیان خەلیفە هــاروون لەگەڵ کۆمەڵێــك لە گەورە پیاوانی دەوڵەتو کەســانی نزیكو وەزیرەکانی کۆدەبێتــەوە، لــەو کاتــەدا باڵــووڵ دێتە ژوورەوە بــۆ ناو کۆشــكو دەڕواتە ژووری کۆبوونەوەکانو لە تەنیشتی خەلیفەوە دادەنیشێت..

هەڵسـووکەوتی ئەو ڕۆژەی حەکیم خەلیفەی ئازاردا، بەڵام لەبەرئەوەی پێشـتر مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی بە فەرمانی خەلیفە پێبەخشراوە، لە هەر کاتو ساتێکدا کە بیەوێت، کەسێك ناتوانێت لە کۆشك دووری بخاتەوە.

لـە هەمان کۆڕدا باڵووڵ لاسـایی کردەوەکانی خەلیفە هاروونی دەکردەوەو قاچی خسـتە سەر قاچو هاوشێوەی خەلیفە دانیشـت، ئامادەبووان بە بینینی ئەو دیمەنە دەسـتیان کـردە پێکەنین، ئـەوەش زیاتر خەلیفەی ئـازاردا، لەو کاتـەدا خەلیفە بیرۆکەیەکـی بە خەیاڵـدا هات، تا بتوانێت لەو ڕێگەیـەوە لەبەرچاوی ئامادەبووان باڵووڵ شـەرمەزار بکات، ئەویش بە ئاڕاسـتەکردنی مەتەڵێکی قورس، کە نەتوانێت وەڵامی بداتەوە.

خەلیفـە وتی: «بێگومان لەبەرئەوەی لە تەنیشـتی منەوە دانیشـتویت، دەبێت بتوانیت وەڵامی ئەم مەتەڵە بدەیتەوە»!

حەکیم بە توانجـەوە وتی: ئەگەر نەمتوانی وەڵامت بدەمەوە، ئەوا دیارییەکەتم پـێ مەدە، هەروەکو چەندین جـار وەڵامی مەتەڵەکانتو پرسـیارەکانتم داوەتەوەو دیاریت پێبەخشیوم!

خەلیفە ویسـتی بە وەڵامێك حەکیم بتاسـێنێت، پێی بڵێ کەی من بەڵێنی خۆم نەبردۆتە سـەر، بەڵام وەبیری هاتەوە کە باڵووڵ کەسـێکی ڕاسـتگۆیەو هەرگیز درۆ نـاکات، لە خۆڕا ئـەو توانجەی نەگرتووە، دیارە چەند جارێـك خەلیفە بەڵێنەکانی نەبردۆتە سەر، لەبەرئەوە هەوڵیدا بە ئارامی مامەڵە لەگەڵ حەکیمدا بکات، خەلیفە وتی: «ئەگەر وەڵامی ئەم مەتەڵەت دایەوە، ئەوا فەرمان دەکەم هەزار سکەی ئاڵتونت پێببەخشـرێت، بەڵام ئەگەر وەڵامەکەت نەزانی فەرمان دەکەم ڕیشت بتاشنو سواری گوێدرێژێکت بکەنو بە کۆڵانەکانی شاردا بتسوڕێننەوە»!!

حەکیم وتی: من پێویستم بە سکەی ئاڵتون نییە، بەڵکو من بە مەرجێك وەڵامی مەتەڵەکەت دەدەمەوە..

هارون: دوای دەستخۆشی، وتی: بابزانین مەرجەکەت چییە؟

حەکیم: ئەگەر وەڵامی مەتەڵەکەتم دایەوە، دەبێت فەرمان بکەی بەو مێشە تا بە جەستەی منەوە نەنیشێتو ئازارم نەدات! حەکیم مەبەستی لەم داوایەی ئەوەبوو کە بیسەلمێنێت خەلیفە دەسەڵاتەکانی کاتییەو تەنانەت ناتوانێت فەرمان بە مێشێك بکات..

خەلیفەش زانی مەبەستی حەکیم ئەوەیە کە دەستەوسانی بکاتو بیسەلمێنێت کە زۆر شت هەیە لەم دونیایەدا لە ژێر فەرمانی خەلیفەدا نییە، کەمێك پێکەنیو وتی: ناتوانم مەرجەکەت جێبەجێ بکەم، چونکە ئەو مێشە فەرمان لە من وەرناگرێت!

ئامادەبووان لە ناخەوە سەرسامو خۆشحاڵبوون بە مەرجەکەی حەکیم، بەڵام نەیاندەوێرا بە زمان خۆشحاڵییەکەیان دەربڕن، کاتێك حەکیم زانی مەرجەکەی کاری کردۆتە سەر خەلیفەو خەمو پەژارە لە ڕوخساریدا بەدیدەکرێت.. وتی: ئێستا ئامادەم بێ هیچ مەرجێك وەڵامی مەتەڵەکەت بدەمەوە..

خەلیفە دەیزانی هەرچۆنێك بێت لە جەدەلو گفتوگۆدا بەرامبەر باڵۆوڵ دەستەوسانەو ناتوانێت گرەوی لێ بباتەوە، حەزی نەکرد لەوە زیاتر بابەتەکە درێژە بکێشێت.. لەبەرئەوە وتی: ئەو درەختە کامەیە کە ژمارەی لقەکانی دوانزە لقەو هەر لقێکیش ٣٠ گەڵای پێوەیەو دیوێکی گەڵاکان ڕووناکنو دیوەکەی تریان تاریك؟

حەکیم بێ وەستانو بیرکردنەوە، بێ شڵەژانو دۆش دامان، دەستبەجێ وتی: «درەختەکە هێمایە بۆ «ساڵ»، لقەکانی هێمان بۆ مانگەکانی ساڵ، گەڵاکانی هێمان بۆ ڕۆژەکانی مانگ، تاریکو ڕووناکییەکەش هێمان بۆ شەوو ڕۆژ»!!

هیچ بوارێك بۆ خۆدزینەوە لە وەڵامەکەی حەکیم نەمایەوە، جگە لەوەی خەلیفە بە دەنگی بەرز هاواری کردو گوتی: ئافەرین، ئافەرین، هەروەها هەموو ئامادەبووانیش دەستخۆشیو ئافەرینیان لێکرد، پاشان حەکیم هەڵساو لە کۆشك چووە دەرەوەو نەکەوتە نێو ئەو تەڵەیەی خەلیفە بۆی دانابوو، لەبەرئەوە سەربەرزانە کۆشکی جێهێشت..



# لێکدانەوەی خەون

حەکیم هەمــوو کات بیرتیژیو لێهاتووییو تواناو شــارەزاییەکەی، دەوروبەری سەرســام کردووە، هەر پرسیارێکی ئاڕاستە کرابێت بە جوانترینو نایابترین شێوە وەڵامی داوەتەوە، هەر کێشــەیەکی بەدی کردبێت لە کەمترین ماوەو بە باشــترین ڕێگەو بەشێوەیەك کە هەمووان پێی ڕازیبن، چارەسەری بۆ دۆزیوەتەوە..

حەکیم هیچ کات دەستەوســان نەبووە لە بەردەم پرســیارە ئاڵۆزەکانو کێشــەو

گرفتە سـەختەکاندا.. دەتوانین بڵێین: حەکیم هەمیشە وەڵامو چارەسەری دروستو گونجاوی لابووە، بۆ هەموو کێشـەئاڵۆزەکان، لێهاتوویی حەکیم بە جۆرێك بووە، کە زۆر ئاستەم بووە کەسێك توانیبێتی فێڵی لێ بکات، یاخود دەستەوەسانی بکات!

لـە چیرۆکـی ئەمجارەی حەکیمدا باس لە وەڵامێکی نـاوازەی حەکیم دەکەین، سەبارەت بە لێکدانەوەی خەون..

چیرۆکەکە بەمشێوەیە دەستی پێکرد، جارێکیان پیاوێك ویستی فێڵێك لە باڵووڵ بکات، بۆئەوەی شتێك پارە دەستبخات.. دەیزانی کە باڵووڵ خاوەنی دڵێکی بێگەردو نییەتێکی پاکە.. دەیزانی کە هەموو کات حەکیم بەدەم یارمەتیدانی خەڵکییەوەیە، بەو ئەندازەی خۆی فەرامۆش کردووە بۆ خەڵکی..

کابرا ویستی ئەم هەلە بقۆزێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە بیری لە فێڵێك کردەوە.. بە ناوشاردا گەڕا تا حەکیمی بەدیکرد، ڕۆیشت بۆ لای حەکیمو سڵاوی لێکردو گوتی: جەنابی حەکیم دوێنێ شەو خەوێکی زۆر سەیرم بینی!

حەکیم وتی: بە ویستی خودا خێردەبێت، بڵێ چیت بینیوە؟

کابرا وتی: لە خەومدا بینیم تۆ سەد دیناری ئاڵتونت پێبەخشیم!!

باڵووڵـی حەکیم، زۆر باش دەیزانی کە کابرا دەیەوێت فێڵی لێ بکاتو بە نیازە لەو ڕێگەیەوە شتێك لە حەکیم وەربگرێتو پاشان بڵێ توانیم حەکیم بخەڵەتێنم..

هەربۆیە حەکیم بە بیستنی ئەو قسەیە کەمێك پێکەنیو دواتر وتی: بەڵێ خەوەکەت ڕاسـتە، هەر بەو شـێوەی کە خۆت بینیوتە.. بەڵام من هەر شتێکم بەخشـی نامەوێتەوە، واتە ئەو سـەد دینـارە ئاڵتونەی لـە خەونتدا من پێم بەخشیویت، نامەوێت بۆم بگێڕیتەوەو گەردنت ئازابێت!!

کابرا بە بیستنی وەڵامەکەی حەکیم زۆر شەرمەزار بوو، زۆرباش تێگەیشت کە باڵووڵ کەسێکی ژیرو دانایەو زۆر لەوە گەورەترە ئەو بتوانێت دەستی ببڕێت.. بە شەرمەزارییەوە ملی ڕێگەی گرتو حەکیمی جێهێشت..

# مامەڵەی نێوان

# باڵووڵ و خاتوو زوبەیدە

حەکیم ئەو کەسەی کە هەموو ڕۆژەکانی ژیانی چیرۆکێکی پەندئامێزی تۆمارکردووە، مرۆڤ بە خوێندنەوەو بیستنی هەڵوێستو ڕووداوو چیرۆکەکانی ژیانی حەکیم، سەرسامو موتەحەییر دەبێت.. گەر هەر پرسیارێك ئاڕاستەی حەکیم کرابێت، وەڵامێکی داوەتەوە کە بووەتە پەندو چیرۆك.. لە چیرۆکی ئەمجارەی حەکیمدا باس لە مامەڵەی نێوان هاوسەری خەلیفە هاروون «خاتوو زوبەیدە»و جەنابی حەکیم دەکەین.. بالۆوڵ ئەو کەسەی کە نەك تەنها شادیو خەندەی بۆ گەورەکان دەگێڕایەوەو چارەسەری گرفتو کێشەکانی دەکردن، بەڵکو ئەوەندە مرۆڤێکی سادە بوو کە هەوڵی دەدا منداڵانیش شادومان بکات.

ڕۆژێکیان بالۆوڵ بە لای کۆمەڵێك منداڵدا تێپەڕی کە سەرگەرمی یاریکردن بوون، ئەویش بێئەوەی گوێ بداتە تەمەنو پلەوپایەی، لەگەڵ منداڵەکاندا دەستیکردە یاریکردن، پێکەوە خانووی بچووك بچوکیان دروست دەکردو ناویان دەنا کۆشك، لەو کاتەدا خاتوو زوبەیدە بەلایاندا تێپەڕی، کاتێك چاوی بە حەکیم کەوت، گوتی: ئەوە سەرقاڵی چیت جەنابی بالۆوڵ؟

حەکیم پێش ئەوەی وەڵامی هاوسەری خەلیفە بداتەوە، بە منداڵەکانی گوت: منداڵەکان ئاگاداری ئەو کۆشکانە بن کە دروستمان کردوون، نەیانڕوخێنن، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لای خاتوو زوبەیدەو وتی: دەبینیت لەگەڵ منداڵەکان سەرقاڵی دروستکرنی کۆشكو تەلارین!

خاتوو زوبەیدە دەیزانی ئەگەر ڕاستەوخۆ هەر چییەك بدات بە جەنابی حەکیم قبوڵی ناکاتو ڕەتی دەکاتەوە، هەروەکو چەندین جار یارمەتیدانی خودی خەلیفەی ڕەتکردۆتەوە، لەبەرئەوە ویستی ئەو هەلە بقۆزێتەوەو لەو ڕێگەیەوە یارمەتییەکی حەکیم بدات، بە حەکیمی گوت: بەڕاستی ئەو کۆشكو تەلارانەی تۆ بۆ منداڵەکانت دروستکردووە جوانو ڕەنگینن، دەمەوێت ئەو کۆشکەتان لێ بکڕم، نرخەکەی چەندە؟

حەکیم سەیرێکی زەوییەکەی کردو وتی: مەبەستت ئەم کۆشکەیە؟ خاتوو

زوبەیدە وتی: بەڵێ.

حەکیم وتی: باشە ڕازیم پێت بفرۆشم، نرخی ئەو کۆشکەیان هەزار درهەمە، بۆ خۆمو ئەو منداڵانەی هاوکارییان کردوم لە دروستکردنیدا..

خاتوو زوبەیدە دەستبەجێ بە خزمەتکارەکەی گوت: نرخەکەیان پێ بدە.. ئەویش هەزار درهەمی دا بە باڵووڵی حەکیمو پاشان ماڵاواییان کردو ڕۆیشتن..

حەکیم کیسە پارەکەی بە دەستەوە گرتو دەستیکرد بە دابەشکردنی بەسەر منداڵەکانو هەژاراندا، تەنانەت یەك درهەمیشی بۆ خۆی هەڵنەگرت.. «ئەم پاڵەوانە چەندە بەخشندە بووە، هەر کات شتێکی دەستکەوتبێت دەستبەجێ بەخشیویەتی بە هەژاران»!

چەند ڕۆژێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی، شەوێکیان خەلیفە هارون لە خەویدا شتێکی زۆر سەیری بینی، لە خەویدا بینی وا بەرێدەکەون بۆ بەهەشت، کاتێك گەیشتە لای دەروازەی کۆشکێکی خۆشو دڵڕفێنو سەرسوڕهێنەر، پێیان گوت: ئەوە کۆشکی هاوسەرەکەت خاتوو زوبەیدەیە! ویستی بچێتە ژوورەوە ڕێگەیان نەدا!

بۆ بەیانی خەلیفە هاروون ئەم خەوەی بۆ زانایانی کۆشك باسکردو داوای لێکردن خەوەکەی بۆ لێك بدەنەوە!

زاناکان پێیان گوت: لە خاتوو زوبەیدە بپرسە، بزانە چ چاکەیەکی گەورەی ئەنجامداوە؟

کاتێك خەلیفە پرسیاری لە خاتوو زوبەیدە کرد، ئەویش بیری کردەوە دەبێت چ چاکەیەکی کردبێت، شیاوی ئەو کۆشکە بێت لە بەهەشتدا!!

هیچی بیرنەهاتەوە تەنها ئەو هەزار درهەمە نەبێت کە بەخشیبووی بە باڵووڵی حەکیم! پاشان چیرۆکەکەی بۆ خەلیفە هاروون گێڕایەوە..

خەلیفە تێگەیشت کە ئەو چاکەیە هۆکاری بەدەستهێنانی ئەو کۆشکە بووە، لەبەرئەوە پێویست بوو بڕوات بە دوای حەکیمدا.. بۆئەوەی ئەویش یەك لەو

کۆشـــکانەی لێ بکڕێت کە لە دونیادا کۆشـــکێکی گاڵتینەیەو لە دوارۆژدا کۆشـــکێکی هەمیشەییە!

خەلیفە لەگەڵ چەند کەســێکدا چوونە دەرەوەی کۆشــکو دەستیان کرد بە گــەڕان بــە دوای باڵووڵدا، لە یەکێك لە گەڕەکەکانی شــاری بەغداد حەکیمیان دۆزییەوە، بینیان بە هەمان شێوە کە خاتوو زوبەیدە وەسفی کردووە، وا لەگەڵ منداڵان یاری دەکاتو سەرقاڵی دروستکردنی کۆشکی منداڵانە، خەلیفە هاروون وا خۆی دەرخست کە حەکیم پشتگوێ دەخاتو بە تایبەت بۆ لای ئەو نەهاتووە، بۆیــە بە ئارامییەوە وتی: دەبینم نزیکترین کەســی مــن لەگەڵ منداڵان یاری دەکات، بە پەنجەکانی خاك هەڵدەکۆڵێت!!

حەکیم وەڵامی دایەوەو وتی: ئێمە چێژو خۆشی دەبینین لەو شتەی خودا لە دونیادا پێی بەخشیوین، دەبینیت من کۆشكو تەلار لەسەر زەوی دروستدەکەم، بۆئەوەی بیفرۆشین!

خەلیفــە زۆر بە دڵخۆشـــیو خەنـــدەوە وتی: هەرچەندە ئەوەی تۆ دروســـتی دەکەیت، وەکو کۆشکی خەلیفەو پاشاکان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا من دەمەوێت یەك لەو کۆشکانەت لێبکڕم!

باڵووڵ دەســتی لە نێو گڵەکە هەڵگرتو بە تیلەی چاوەکانی ســەیرێکی خەلیفەی کردو وتی: دەتەوێت کۆشکێکی ئاوەها بکڕیت؟

خەلیفە لەســەر ئەژنۆ لەبەردەمیدا دانیشـــتو وتی: بەڵێ من دەمەوێت بە هەر نرخێك بێت ئەم کۆشکە بکڕم!!

حەکیم بە وردی ســەرنجی خەلیفەی داو پاشان دەستیکردە پێکەنینو وتی: ئەم کۆشکە نرخەکەی زۆر گرانە!

خەلیفە وەها خۆی دەرخســت کە گرنگی بــە پێکەنینەکەی حەکیم نادات، وتی: ئێمە هەر شتێکمان بوێت بە هەر نرخێك بێت دەیکڕین، کێشەیەك نییە!

حەکیم وەکو ئەوەی ئاگاداری تەواوی وردەکاری خەونی خەلیفە بێت، وتی: نرخی ئەم کۆشــکە هەزاران ســکەی زێڕو باخاتی گەورەو ماڵو ســامانێکی بێ شومارە!

خەلیفە کەمێك بێدەنگ بوو، پاشــان تووڕەبوو، وتی: ئەگەر سەروەتو سامانی هەمــوو دەوڵەمەندەکانی ئەم شــارە کۆبکەینــەوە، ناگاتە ئەو نرخــەی تۆ داوای دەکەیت، جەنابی حەکیم!

مەبەســتت لەو قســانە چییە، چی لە پشــت ئەم نرخە خەیاڵییەوە خۆی حەشارداوە؟!

لــە کاتێکدا کۆشــکێکی هاوشــێوەی ئەم کۆشــکەت بە زوبەیدەی هاوســەرم فرۆشتووە، تەنها بە هەزار درهەم!

حەکیم هەڵســایە ســەرپێو گوتــی: جەنابی خەلیفــە، جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان تۆو خاتوو زوبەیدەدا، زوبەیدە هیچی نەبینیبوو، ئەو کۆشکەی بــەو نرخە زۆرە لێکرین، بەڵام تۆ بینیوتەو دەتەوێت بە هەمان نرخ کۆشــکە گاڵتینەکەی دونیا لە بری کۆشکە ڕازاوەو هەمیشەییەکەی قیامەت بکڕی؟!

حەکیــم بە لێهاتوویی‌و زیرەکــی‌و بیرتیژی خۆی دەیزانــی کە خەلیفە لە خۆڕانەهاتــووە، هەمان ئەو کارە بــکات کە هاوســەرەکەی کردوویەتی، یاخود دەگونجێت حەکیمیش هەمان خەوی بینبێت..

بەڵێ خۆشەویســتان یارمەتیدانی هەژارانو بــێ نەوایان، هەر لە دنیادا بە ســەدان قات پاداشت دەدرێتەوە، لە قیامەتیشدا پاداشتەکەی کۆشکە ڕازاوەکانی بەهەشتە، لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ماڵ بەبەخشین کەم ناکات!

کەواتە ببەخشە، دڵنیابە خودا زیاترت پێ دەبەخشێت!



# گەشتیارێکی بیانی

چیرۆکێکــی دیکە لە چیرۆکەکانی حەکیم، کە بــاس لە بیرتیژیو دانایىو زانایی بالوولی حەکیم دەکات، لێهاتوویی حەکیم بە ئەندازەیەك بوو کە لە هەر شــوێنێك وەزیرو زاناکان دەستەوەستان بوونایە، لە بەرامبەر پرسیارو ڕووداوو پێشــهاتەکان، دەستبەجێ بە دوای حەکیمدا دەگەڕانو چارەسەریان لە هەگبەی پڕ حیکمەتو دانایی بالوولدا چنگ دەکەوت..

جارێکیان گەشـــتیارێکی بیانی هاتە نێوشـــاری بەغداد، ڕۆیشـــت بۆ کۆشکی خەلیفـــە هـــارون، لەو کاتـــەدا خەلیفەو وەزیـــرەکانو زانایان، ئامـــادەی کۆڕو کۆبوونـــەوەی خەلیفـــە بوون، گەشـــتیار دوای ســـڵاوکردنو حەوانـــەوەو دوای مۆڵەت وەرگرتن لە جەنابی خەلیفە، چەند پرســـیارێکی ئاڕاســـتەی وەزیرانو زانایانو ئامادەبووان کرد، بەڵام هیچ کام لەوان نەیانتوانی وەڵامی پرسیارەکانی گەشتیارەکە بداتەوە..

بـــەوەش خەلیفە زۆر تووڕەبوو، بە وەزیـــرانو زانایانی گوت: ئەگەر وەڵامی پرسیارەکانی ئەو گەشتیارە نەدەنەوە، ئەوە هەموو سامانەکەی ئێوە دەبەخشم بەو گەشتیارە!

ئامادەبووان داوای ٢٤ کاتژمێر مۆڵەتیان کرد، خەلیفەش مۆڵەتی دان.. یەکێك لـــە وەزیرەکان وتی: تەنها چارەســـەر ئەوەیە کە باڵووڵـــی حەکیم بدۆزینەوە، چونکە تەنها حەکیم دەتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە ئاڵۆزانە بداتەوە، گەڕان تا باڵوولیان دۆزییەوە، کاتێك هەواڵەکەیان بە حەکیم ڕاگەیاند، حەکیم ئامادەیی نیشاندا بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی گەشتیارەکە.

بۆ ســـبەی کە بڕیاربوو وەڵامی پرســـیارەکانی گەشتیارەکە بدەنەوە، باڵوولی حەکیم ئامادەبوو، ڕووبەڕوی گەشـــتیارەکە وەستاو وتی: هەر پرسیارێکت هەیە ئاڕاستەی منی بکە، تا وەڵامی دروستت بدەمەوە..

گەشـــتیارەکە بـــە عەصاکەی بازنەیەکی کێشـــا، دواتر ڕووی کـــردە باڵووڵ، وەك ئـــەوەی چاوەڕوانی وەڵامـــی لێ بکات، باڵووڵ بێ ڕاوەســـتانو دوودڵی، بە عەصاکـــەی خەتێکی بە ناوەڕاســـتی بازنەکەدا کێشـــاو بازنەکـــەی کرد بە دوو بەشـــەوە، گەشـــتیارەکە بازنـــەیەکی دیکەی کێشـــا، ئەمجارەیان باڵوولی حەکیم بازنەکەی کرد بە چوار بەشـــەوەو دەســـتی خســـتە ســـەر یەکێك لە بەشەکانو گوتی: ئەم بەشە وشکانییەو ئەو سێ بەشەی دیکەش ئاوە!

گەشـــتیار زانی کە وەڵامی پرســـیارەکانی حەکیم ڕاســـتو دروســـتن، دواتر پرســـیارێکی قورســـتری ئاڕاســـتە کرد، پشـــتی دەســـتی خستە ســـەر زەمینو پەنجەکانیشـــی بەرەوە ئاسمان دانا، حەکیم بێ وەستان پێچەوانەی گەشتیارەکە پەنجاکانی لەســـەر زەمین داناو پشـــتی دەستی کردە ئاســـمان، گەشتیارەکە زۆر سەرســـام بوو بە بیرتیژیو لێهاتوویـــی باڵوولی حەکیم، لەبەرئەوە بە خەلیفە هاروونی گوت: پێویستە زۆر شانازی بکەیت بەم زانایەوە، کە لە جیهاندا وێنەی دەگمەنە، خەلیفە پرسی من لە پرسیارو وەڵامەکانتان تێنەگەیشتم؟

گەشـــتیارەکە وتی: کاتێك یەکەم بازنەم کێشـــا، مەبەستم لە گۆی زەوی بوو، باڵوول لە مەبەســـتی پرســـیارەکەم تێگەیشتو دەستبەجێ بە منی سەلماند کە مەبەســـتم گۆی زەوییە، هەربۆیە کردی بە دوو بەشەوەو نیشانی دام کە زەوی لە باکورو باشـــور پێکهاتووە، کاتێکیش بازنەی دووەمم کێشـــا، باڵوول کردییە چوار بەشـــەوەو بە منی گوت: کە زەوی لە چوار بەش پێکهاتووە، ســـێ بەشـــی ئاوەو بەشێکی وشکانییە، پرسیاری سێیەم کە من پشتە دەستم لە زەمین داناو پەنجەکانم ڕووەو ئاســـمان، باڵوول پێچەوانەی منی کرد، بە منی ســـەلماند کە من مەبەســـتم ڕووەكو گژوگیای زەویو گۆڕانکارییەکانی زەوییە، باڵوولیش بە دەســـتی وێنەی خۆرو بارانی کێشـــاو بە وەڵامەکەی تێی گەیاندم، کە گەشـــەی ڕووەکـــەکانو گژوگیای ســـەرزەوی، بە هۆی بارانو تیشـــکی خۆرەوەیە، کەواتە شانازی بکە کە خاوەنی وەها زانایەکی بە توانای، جەنابی خەلیفە!

ئامادەبووانیـــش کـــە بە هـــۆی داناییو لێهاتوویـــی باڵوولـــی حەکیمەوە لە تووڕەیـــیو ڕقی خەلیفـــە ڕزگاریان بوو، زۆر سوپاســـی حەکیمیان کرد کە لەو تەنگژەیە ڕزگاری کردن.

# وەڵامە دروست و بەهێزەکانی حەکیم

حەکیم لە ماوەی ژیانیدا هیچ پرسیارێکی ئاڕاستە نەکراوە، وەڵامێکی دروستو بەپێزو بەهێزی نەدابێتەوە. وەك هەمیشەش جاروبار خەلیفە هارون پرسیاری سەختی ئاڕاستەی حەکیم کردووەو زۆرجار لە بەرامبەر وەڵامە بەهێزەکانیدا، خەڵاتی زۆر گەورەی کردووە.

ئێستا با پێکەوە وەڵامی ئەو پرسیارە ببیستین کە خەلیفە هاروونی سەرسام کرد..

جارێکیان حەکیم سەردانی خەلیفە هاروونی کرد، بینی خەلیفە سەرقاڵە.. کاتێك خەلیفە حەکیمی بینی، پرسیارێکی ئاڕاستە کردو وتی: ئایا ئەگەر کەسێك ترێ بخوات حەرامە؟



حەکیم وتی: نەخێر.

پاشان خەلیفە وتی: باشە دوای خواردنی ترێ ئاو بخۆیتەوە، کێشەیەکی هەیە؟

حەکیم وتی: نەخێر هیچ کێشەیەکی نییە!

دواتر خەلیفە وتی: باشـــە دوای خواردنی ترێو خواردنەوەی ئاو، ئەگەر کەمێك لەبەر خۆرەتاو دابنیشی گرفتێکی هەیە؟

دووبارە حەکیم وتی: نەخێر هیچ گرفتێکی نییە!

دواجار خەلیفە وتی: ئەی باشە بۆچی ئەگەر هەمان ترێو هەمان بڕی ئاو لەبەر خۆرەتاو دابنێیت، حەرام دەبێت؟!

حەکیم زۆر بە ئارامییەوە وتی: ئایا ئەگەر ئەندازەیەك خۆڵ بەر سەری کەسێك بکەوێت، زیانی پێ دەگەیەنێت؟

خەلیفە وتی: نەخێر.

حەکیم وتی: ئەگەر دوای ئەوەی خۆڵەکە بەر سەری کەسەکە کەوت، کەمێك ئاوی بکەیت بەسەردا زیانی پێدەگات؟ خەلیفە وتی: بێگومان نەخێر..

حەکیم وتی: باشە ئەگەر هەمان خۆڵو ئاو تێکەڵ بە یەکتری بکەیتو خشتێکی لێدروست بکەیت، دواتر بیکێشی بەسەری کەسێکدا، ئایا زیانی پێدەگەیەنێت؟

خەلیفە وتی: بێگومان سەری دەشکێنێت!

حەکیم وتی: کەواتە چۆن پێکهاتەی ئاوو خۆڵ سەری مرۆڤ دەشکێنێتو ئازاری پێدەگەیەنێت، بە هەمان شێوە پێکهاتەی ئاوو ترێ خراپەو خواردنی ئەو پێکهاتەیە، زیان بە مرۆڤ بگەیەنێتو دوچاری نەهامەتی بکات!

هەرچەنـــدە وەڵامەکـــەی حەکیم زۆر بەهێـــزو بەپێزە، بەڵام لێرەدا ســـەرنجتان ڕادەکێشم بۆ وەڵامی زانایەك لەسەر هەمان تەوەرە، چونکە هەستدەکەم ئەم وەڵامەش هاوشێوەی وەڵامەکەی حەکیم، زۆر بەهێزو بەپێزە!

جارێکیان مەســـیحییەك میوانداری زانایەکی موسوڵمانی کرد، چەند هێشوویەك ترێی جوانی پێشکەشـــی میوانەکە کردو پێکەوە دەســـتیان بە خواردنی کرد، دواتر

مەسیحییەکە پێکێك شەرابی بۆ میوانەکەی هێناو لەبەردەمیدا داینا. زانای موسوڵمان وتی: ببورە لە ئاینی ئێمەدا شەراب حەرامە، لەبەرئەوە من شەراب ناخۆمەوە!

مەسیحییەکە وتی: باشە، پێش ئێستا پێکەوە ترێمان نەخوارد؟

زاناکە وتی: بەڵێ!

مەسیحییەکە: ئەی مەگەر شەراب لە ترێ دروست ناکرێت، ئیدی بۆ ترێ حەڵاڵەو بەرهەمەکەی حەرامە؟ ئایا ئەمە لۆژیکە؟

زاناکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: تۆ خێزانت هەیە؟ مەسیحییەکە وتی: بەڵێ؟

زاناکـە وتـی: بێگومان بۆ ئێوە دروسـتەو حەڵاڵە کە پێکەوە بنو هاوسـەرداری بکەن؟

مەسیحییەکە وتی: بێگومان!

دواتر زاناکە وتی: ئایا کچت هەیە؟

مەسیحییەکە وتی: بەڵێ..

زاناکە وتی: ئایا دروستە لەگەڵ کچەکەت کە بەرهەمی خێزانەکەتە هاوسەرداری بکەیت؟!

مەسیحییەکە وتی: بێگومان نەخێر..

زانـای ژیرو بە ئەزمـوون وتی: کەواتە هەروەکو چـۆن خێزانت بۆ تۆ حەڵاڵەو بەرهەمەکـەی لە تۆ حەرامـە، هەرواش ترێ حەڵاڵەو ئەو شـەرابەی کە بەرهەمی ترێیە حەرامە، لەبەرئەوە مەرج نییە هەر شتێك خۆی حەڵاڵ بێت، بەرهەمەکەشی حەڵاڵ بێت!

# کەشی ئارامی ناوماڵ

لە چیرۆکی ئەمجارەماندا سەبارەت بە ژیاننامەی حەکیم، باس لە سەردانێکی حەکیمو خەلیفە هاروون دەکەین، بۆ قوتابخانەی (ئەمینو مەئموون)، کوڕەکانی خەلیفــە هارون.. ڕۆژێك حەکیم بۆ دیداری خەلیفە بەڕێکەوت بۆ کۆشــك، لە ڕێگەدا چاوی بە خەلیفە کەوت، خەلیفە دوای ســڵاوکردن پرســی: حەکیم بە نیازی بۆ کوێ بڕۆیت؟

حەکیم لە وەڵامدا وتی: بە نیازبووم بێم بۆ کۆشــك بۆ دیداری بەڕێزتان.. خەلیفە وتی: من بە نیازم سەردانی مامۆستای منداڵەکانم بکەم، بە مەبەستی هەواڵ پرسینیان، دەتوانیت هاوڕێیەتیم بکەیتو لەگەڵمدا بێیت؟

حەکیم ڕەزامەندی دەربڕیو لەگەڵ خەلیفە ڕۆیشتن بۆ لای ئەو مامۆستایەی کە ئەمینو مەئمون وانەیان لەلا دەخوێند، کاتێك گەیشتنە قوتابخانەو چاویان بە مامۆســتاکەیان کەوت، خەلیفە وتی: ئەمینو مەئمون لە کوێن؟ مامۆستاش وتی: پێش ئێوە مۆڵەتی چەند خولەکێکیان وەرگرتووەو بۆ کەمێك پشــوودانو یاریکردن چوونەتە دەرەوە، خەلیفە هارون هەواڵی تواناو کۆشــشو لێهاتوویی‌و زیرەکی منداڵەکانی لە مامۆستاکەیان پرسی، مامۆستاش لە وەڵامدا گوتی: ئەمین کەم تواناترە لە مەئمون، واتە مەئمون زیرەکترو لێهاتووترو بیرتیژ ترە!

لەبەرئەوەی ئەمین منداڵی خاتوو زوبەیدە بوو، خەلیفەش خاتوو زوبەیدەی زۆر خۆشدەویست، وەڵامی مامۆستاکەی زۆر پێناخۆش بوو، وتی: هەرگیز بڕوا ناکەم مەئمون لە ئەمین زیرەکتر بێت! ئایا دەتوانیت قسەکانت بسەلمێنیت؟

مامۆستاش بۆ ســەلماندنی قسەکانی تەنها کاغەزێکی خستە ژێر جێگەکەی مەئمونەوە، بەڵام خشــتێکی خستە ژێر جێگاکەی ئەمینەوە، دوای ئەم وتوێژە هەردوو کوڕەکەی خەلیفە گەڕانەوە بۆ قوتابخانەکەیانو بینیان ئەوا خەلیفەی باوکیان بەمەبەســتی هەواڵ پرسینیان، بۆ سەردانی قوتابخانەو مامۆستاکەیان هاتووە، بەڕێزەوە ســڵاوییان لە باوکیــان کردو بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردو دواتر ڕۆیشتنە سەرجێگەکانی خۆیان دانیشتن، هەر کەدانیشتن مەئمون کەوتە بیرکردنەوەو بەملاو لای خۆیدا دەیڕوانیو دیقەتی شوێنی دانیشتنەکەی دەدا، مامۆستا لە مەئمونی پرسی: بۆچی دەڕوانیت، ئایا هەستت بە شتێك کردووە؟

مەئمون وتی: بەڵێ مامۆســتا، هەستدەکەم بە ئەندازەی کاغەزێك جێگەکەم بەرز بووەتەوە!

دواتر لە ئەمینی پرسی: ئەی تۆ هەست بە چی دەکەیت؟

ئەمین لە وەڵامدا وتی: من هەست بە هیچ گۆڕانکارییەك ناکەم کە ڕوویدابێت!

دواتـــر مامۆســـتا بە ئەمیـــنو مەئمونی گـــوت: ئێوە دەتوانن بـــڕۆن وانەی ئەمرۆمان تەواو بوو، من کەمێك لەگەڵ باوکتان قســـە دەکەم، دوای ڕۆیشـــتنی منداڵەکان مامۆستا بە خەندەوە ڕووی کردە جەنابی خەلیفەو وتی: سوپاس بۆ خودا کە توانیم بۆچوونەکانم بسەلمێنم!

خەلیفە بەسەرسامییەوە پرسی: ئایا هۆکاری ئەو جیاوازییە دەزانیت؟

پێش ئەوەی مامۆستاکەیان وەڵام بداتەوە، حەکیم وەڵامی دایەوەو وتی: من وەڵامی ئەو پرسیارەت دەدەمەوە!

خەلیفە هارون کە بڕوای تەواوی بە وەڵامەکانی حەکیم بوو، وتی: بفەرموو!!

حەکیم وتی: زیرەکیو لێهاتووی منداڵ دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵی سەرەکی:-

١- ئەندازەی خۆشەویستی دایكو باوك، بۆ یەکتری.

٢- جیـــاوازی جۆری نەتەوەی دایك لەگەڵ باوکـــدا، خەلیفە هارونو خاتوو زوبەیـــدە هەردوکییان لە یەك نەتەوەن، بەڵام خەلیفـــەو دایکی مەئمون یەك نەتەوە نینو جیاوازن!

خاڵی یەکەم ئاماژەیە بۆ ئاشـــتەوایی ماڵ، بێگومان ئەگەر کەشی ماڵ پڕبوو لە تەباییو خۆشەویســـتیو ڕێزگرتنی یەکتری، کاریگەری زۆری دەبێت لەســـەر زیرەکیو لێهاتوویی منداڵ.

خاڵی دووەمیش واتە زیرەکی منداڵ پەیوەســـتە بە دایکەوە، زیاتر لە باوك، حەکیم هۆکاری زیرەکی مەئمون دەگەڕێنێتەوە بۆ دایکی، ئەمەش بۆچوونێکی زانستییەو زیاتر دایکان ڕۆڵیان هەیە لە زیرەکی منداڵدا.

حەکیم بۆ هەموو پرسیارێك، وەڵامێکی دروستی لابووە!



# بوێری بالوولی حەکیم

حەکیم سەرەڕای ئەوەی زاناو دانا بوو، وەڵامەکانی دروستو بەپێز بوون، ژیرو لێهاتوو بوو، خوداپەرستو دونیا نەویست بوو، لە هەمان کاتدا کەسێکی چاو نەترسو ئازا بوو، هەرگیز لە خەلیفەو دەسەڵاتداران نەترساوەو هەرچی حەقو ڕاستی بووە بێ سڵەمینەوە بەرامبەر دەسەڵاتدارانو کاربەدەستان ڕاشکاوانە وتویەتیو لە سزاو ئازاریان سڵی نەکردۆتەوە، هەڵوێستی ناوازەی وەهای هەبووە کە بە سەدان کەس نەیانتوانیوە وەها هەڵوێستێك بەرامبەر دەسەڵاتداران بنوێنن..

لە چیرۆکی ئەمجارەدا باس لە هەڵوێستێکی ناوازەو دەگمەنی حەکیم دەکەین، کە بەرامبەر خەلیفە هاروون نواندوویەتی، ڕووداوەکە بەمشێوەیە بوو:-

ڕۆژێکیان خەلیفە هاروون کیسەیەك دراوی دا بە بالوولی حەکیم، پێی گوت بڕۆ دابەشی بکە بەسەر کەسانی هەژارو نەداردا، حەکیمیش پارەکەی وەرگرتو ڕۆیشت بۆ نێو بازاڕو کوچەو کۆڵانەکانی شاری بەغداد، بە دوای کەسێکدا دەگەڕا کە هەژارو نەدار بێتو پێویستی بە یارمەتی هەبێت، تا بڕێك لەو پارەیەی پێ

بـدات کـە خەلیفە پێی داوە، بەڵام دوای گەڕانوماندووبوونێکی زۆر، پارەی بە هیچ کەس نەدا.. کیسـە پارەکەی وەکو خۆی بـردەوە بۆ خەلیفەو لە بەردەمی خەلیفەدا دایناو پێی گوت: زۆر گەڕام، ئەوەندە گەڕام کە ماندووبووم، پێیەکانم برسـتییان لێبڕا.. بەڵام هیچ کەسـم نەبینـی لە خەلیفە هەژارتـرو نەدارتر، لەبەرئەوە پارەکەم هێنایەوە تا بیبەخشـم بەو کەسـەی کە لە هەمووان زیاتر ئاتاجە، بەو کەسەی کە لە هەمووومان زیاتر هەژارە، ئەویش جەنابی خەلیفەیە!

خەلیفە دەیزانی حەکیم مەبەسـتێکی هەیەو ئەو کارەی بێ حیکمەت نییە، لەبەرئـەوە پرسـیاری ئەو ڕەفتـارەی باڵووڵی حەکیمی کـردو داوای لێکرد تا هۆکاری ئەو کارەی ڕوون بکاتەوە؟

حەکیم لە وەڵامدا وتی: من لە بازاڕداو لەبەردەم هەر دووکانێکدا سـەربازو دارودەسـتەکەی تـۆم بینی وەسـتابوون، بـە زۆر باجو سـەرانەیان لە خەڵکی وەردەگـرتو دەیانهێنا بـۆ گەنجینەو خەزێنەی جەنابـی خەلیفە، لەبەرئەوە واهەستدەکەم کە تۆ لە هەمووومان زیاتر پێویستت بە پارەو سامانە، چونکە تۆ ئەگەر ئاتاج نەبی، بۆچی بەزۆر سەرانە لە خەڵکی وەردەگری؟! هەرلەبەرئەوە پارەکەم گێڕایەوە بۆخەزێنەی تۆ!

مرۆڤـی ئازاو بەخشـندە ئەو کەسـەیە کە لە ڕەنـجو ماندوبوونی خۆی دەبەخشـێت، لەو ماڵو سـامانە دەبەخشێت کە بە هۆی کارو کاسبی حەڵاڵی خۆیەوە پەیدای کردووەو مافی هیچ کەسـێکی بەسەرەوە نییە، سامانێك کە دوور لە فێڵو دەستبڕین، دوور لە ساختەکاریو بێ ویژدانی پەیدای کردووە، هەر لەو ماڵە دەبەخشـێت، ئازایەتیو بەخشـندەیی لەو ماڵەدا نییە کە بە فرتو فێڵو دەسـتبڕین پەیدابووە، یاخود ئەو ماڵەی کە لە کەسانێکی زەوت بکەیتو بیبەبخشیت بە کەسانێکی دیکە! بەڵکو ئازایەتی ئەوەیە کە لەو ماڵە ببەخشیت، کە پاكو حەڵاڵەو دوور لە فێڵو ساختەکاریی پەیدا بووە!

لـەم چیرۆکـەدا، باس لە هەڵوێسـتێکی دیکەی لێوان لێو لـە ئازایەتیو بوێریی باڵووڵی حەکیم دەکەین، سـەبارەت بە وەڵامدانەوە بەهێزو پڕماناکانی، بەرامبەر بە خەلیفە هاروون..

ڕۆژێکیان، حەکیم لەسـەر شەقامێك ڕاوەسـتابوو، کاروانی کەژاوەی خەلیفە، بە کۆمەڵێـك سـەربازەوە بە بەردەمیدا تێدەپـەڕن، باڵووڵیش، بە دەنگـی بەرز هاوار دەکاتو دەڵێـت: ئەی هاروون...هاروون کە خەلیفەی وڵاتو دەسـەڵاتدارەو کۆمەڵێك سـەربازی لەگەڵدایەو بە نێو شـەقامەکانی شـاردا، بە لە خۆباییبوونەوە ڕێگە تەی دەکەن.. سەرسام دەبێت، کە کەسێك بەو شێوەیە بانگی دەکات، هەر بۆیە دەپرسێت: ئەوە کێیە بەوشێوەیە بانگم دەکات؟

سەربازەکان وتیان: جەنابی خەلیفە ئەوە باڵووڵە!

خەلیفە بانگی کردو وتی: باڵووڵ ئایا دەزانیت من کێم؟

وتی: بەڵێ باش دەزانم، کە جەنابتان کێن!!

خەلیفە وتی: کەواتە من کێم؟

حەکیم لە وەڵامدا وتی: تۆ ئەو کەسەیت، ئەگەر کەسێك لە ڕۆژهەڵات ستەمی لێ بکرێـت، تۆش لە ڕۆژئاوا بیت، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا، لە تۆ دەپرسـێتەوە لەسەر ئەو ستەمەو محاسەبەت دەکات!!

خەلیفە بە بیسـتنی ئەو وەڵامە گورچکبڕە، چاوەکانی پڕبوون لە ئەسـرین، بە گریانەوە وتی: ئەی باڵووڵ حاڵی من چۆن دەبینیت؟

حەکیـم وتـی: خۆت بخەرە بـەر تەرازووی ئـەم ئایەتە پیرۆزە، خـوای گەورە دەفەرموویت:-

﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ﴿١٤﴾﴾ الانفطار: ١٣ ــ ١٤

واتە: چاکەکاران لە بەهەشتی بەریندان، خراپەکارانیش لە دۆزەخدان..

خەلیفە وتی: ئەی کردەوەکانی من چۆن دەبینیت؟

حەکیـم: خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ المائدة: ٢٧

واتە: خودای گەورە تەنها لە پارێزکاران، چاکە قبوڵ دەکات.

خەلیفە وتی: ئەی نزیکایەتیی من لەگەڵ پێشەوای مرۆڤایەتی (سەلامی خوای لێبێت) چۆن دەبینیت؟

حەکیم وتی: ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ المؤمنون: ١٠١

واتە: هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتی لەو ڕۆژەدا نییەو کەس لە کەس ناپرسێتەوە! (کەس خەمی کەسی نییەو هەر کەس خەمی خۆیەتی)!

خەلیفە: ئەی شەفاعەتی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) چی؟

حەکیم بەم ئایەتە وەڵامی دایەوە: ﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ طه: ١٠٩.

واتە: لەو ڕۆژەدا تکاو شەفاعەت لە کەس وەرناگیرێتو بێسوودە، مەگەر کەسێك خودای میهرەبان مۆڵەتی بدات.

پاشان خەلیفە وتی: ئەی باڵوول، ئایا پێویستییەکت هەیە، تا بۆت جێبەجێ بکەم؟

حەکیم وتی: بەڵێ.

خەلیفە وتی: هەرچیت دەوێت، پێم بڵێ، تا بۆت جێبەجێ بکەم..

حەکیم وتی: دەمەوێت لێم خۆشبیتو بمخەیتە بەهەشتەوە!

خەلیفە وتی: خۆت دەزانیت، ئەوە بە دەستی منو لە دەسەڵاتی مندا نییە.. ئەی باڵوول.

حەکیم وتی: ئەی کەواتە: تۆ دەتوانیت چیم بۆ بکەیت؟

خەلیفە وتی: ئەگەر قەرزی کەسێکت لەلایە. پێم بڵێ، تا بۆت بدەمەوە؟

حەکیم وتی: ئەی هاروون قەرز تەنها بە قەرز دەدرێتەوە.. کەواتە ماڵی خەڵکی بگێڕەوە بۆ خاوەنەکانیان.

هارون وتی: فەرمان دەکەم کە ڕۆزیی تۆ لەسەر من بێت، تا ئەو ساتەی لە ژیاندایت..

حەکیم وتی: ئەی هارون منیشو تۆش، بەندەی خودای گەورەین، ئایا وا هەست دەکەیت تۆی لە یادەو منی لە یاد کردووە؟؟!!

خەلیفە بە وەڵامەکانی حەکیم، سەرسام بوو!

بالۆوڵی حەکیم

# باڵووڵ و پزیشک و فەیلەسووف

حەکیم بۆ هەر پرسیارێك وەڵامێکی گورجکبڕی پێبووە، لە مێژووی ژیانیدا، نەبیستراوە هیچ کەس بە وەڵامێك حەکیمی تاساندبێت، بەڵام هەر کەس پرسیارێکی ئاراستە کردبێت، بە وەڵامێکی بەپێزو بەهێز تاساندوویەتی، بە جۆرێك، کە بەرامبەری بێدەنگ کردووە، ئەمە چ جای ئەوەی ئەگەر بەرامبەرەکەی، پرسیارەکەی بۆ گاڵتەکردنو سەرخستنەسەر حەکیم بووبێت، ئەوا وەڵامێکی وەرگرتوە، کە هەرگیز بە خەیاڵیدا نەیەت، جارێکی دیکە پرسیار ئاراستەی حەکیم بکات.

لە چیرۆکی ئەمجارەی حەکیمدا، باس لە وەڵامی حەکیم دەکەین بۆ پزیشکێکی یۆنانیو فەیلەسوفێك کە خەلیفە هاروون، بانگهێشتی کردبوون بۆ شاری بەغدا!

خەلیفە هاروون، بە تایبەتی دەنێرێت بە دوای پزیشکێکی زۆر شارەزاو لێهاتوودا، لە وڵاتی یۆنان.. کاتێك پزیشکەکە دەگاتە بەغدادو دەچێتە ناو کۆشکی خەلیفەوە. خەلیفە هاروون زۆر ڕێزی لێدەگرێتو مەراسیمی تایبەتو شیاوی بۆ سازدەکات..

ڕۆژانە خەڵکی، دەستە دەستە دەچوون بۆ پێشوازیی پزیشکو بەخێرهاتنیان دەکرد.. گەورە پیاوانو کاربەدەستانی شاری بەغداد، بۆ بەخێرهاتنی پزیشکی بەناوبانگ، ڕیزیان بەستبوو، کاتێك حەکیم ناوبانگی ئەم پزیشکەی بیست، حەزی کرد سەردانی بکات، لە ڕۆژی سێهەمدا، حەکیم بە یاوەری چەند کەسێك لە هاوەڵو نزیکانی، ڕۆیشتن بۆ کۆشکی خەلیفە، بۆ دیتنو بەخێرهاتنی پزیشکی بەناوبانگو شارەزای یۆنانی.. لە کاتی خۆناساندنو گفتوگۆدا، لەناکاو حەکیم پرسی: ببورە، جەنابتان ئیشتان چییە؟

پزیشکەکە لەوەو پێش باسی بالووڵیان بۆ کردبوو، لەبەرئەوە، ویستی کەمێك سەربخاتە سەریو گاڵتەی لەگەڵدا بکات.. داماو، بێخەبەر لە وەڵامە گورچکبڕەکانی حەکیم.. پزیشکەکە وتی: من دکتۆرم، دەتوانم مردوو زیندوو بکەمەوە!!

حەکیم لە وەڵامـدا گوتی: تۆ زیندووەکان مەکوژە، مـردوو زیندووکردنەوە، پێشکەش بە خۆت بێت!!

بە وەڵامی حەکیم خەلیفە هارونو سەرجەم ئامادەبووان دەستیان کرد بە قاقای پێکەنین.. هەر ئەو ڕۆژە پزیشکەکە ڕۆیشتو بەغدادی جێهێشتو هەرگیز نەگەڕایەوە ئەو شارە.

جارێکی دیکە، فەیلەسوفێك میوانی خەلیفە هارون بوو، حەکیم لەگەڵ دووان لە هاوڕێکانیدا، ڕۆیشتن بۆ کۆشك بۆ دیتنی فەیلەسوف، دوای بەخێرهاتنو یەکترناسین، حەکیم بە میوانەکەی خەلیفە هاروونی گوت: کاری بەڕێزتان چییە؟

فەیلەسوفەکە، کە لە جلوبەرگو شێوەو ڕوخساری حەکیم وردبـووەوە، وا هەستیکرد کە ئەم کەسە دێوانەیەو عەقڵی زۆر تەواو نییە.. پێشتریش لەبارەی بالووڵەوە هەندێك شتی بیستبوو، لەبەرئەوە پێی گوت: من فەیلەسوفم، کاری من ئەوەیە، ئەگەر کەسێك عەقڵی لەسەریدا نەمابێتو فڕی بێت، عەقڵی بۆ بهێنمەوە شوێنی خۆی!

حەکیم گوتی: نا، تۆ بە قسەکانت عەقڵی سەری کەس ناچار بە فڕین مەکە، لەو کەسەش گەڕێ، کە عەقڵی فڕیوەو لە سەریدا نەماوە!




# باڵووڵ و مامۆستای بەغدادی

مامۆستای بەغدادی، لە یەکێك لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری بەغداد نیشتەجێبوو، قوتابیگەلێکی زۆری هەبوو، وانەیان لەلا دەخوێند، ڕۆژانە قوتابییەکانی لە دەوری مامۆستاکەیان کۆدەبوونەوەو گوێیان بۆ مامۆستاکەیان ڕادەدێرا.. ئەم مامۆستایە بیروبۆچوونی سەیرو سەمەرەی هەبوو، بە تایبەت سەبارەت بە بیروباوەڕ.. زۆرجار شتی سەیرو سەمەرەی دەگوت.

ڕۆژێك کابرایەك هات بۆ لای باڵووڵو وتی: فلانە مامۆستا شتی سەیر باس دەکات، بە جۆرێك کە لەگەڵ بیروباوەڕی موسوڵمانان‌اندا یەکناگرێتەوە!

باڵووڵی دانا، بڕیاری دا ڕۆژێك لە کاتی وانە وتنەوەدا، بڕوات بۆ لای، تا بە تەواوی گوێی بۆ بگرێت، نەبادا ئەوەی لەبارەیەوە دەوترێت، ڕاست نەبێت.. بۆ سبەی، حەکیم ڕۆیشت بۆ کۆڕی وانەخوێندنو لە دووری قوتابییەکانەوە دانیشت..

هەرچەندە قوتابییەکان شوێنیان بۆ کردەوەو فەرموویان کرد، تا نزیك بێتەوە، بەڵام حەکیم لای دەرگاکە دانیشتو وتی: هەر ئێرە باشە بۆ من، ئیدی گوێی بۆ وتەکانی جەنابی مامۆستا ڕادێرا!

مامۆستاکە دەستی بە قسەکردن کردو وتی: خەڵکینە زۆرێك لە موسوڵمانان بڕوایان وایە، کە ئیبلیس لە ڕۆژی قیامەتدا بە ئاگر سزا دەدرێت، بە ڕاستی من پێچەوانەی ئەو بۆچوونەم!

یەك لە قوتابییەکان وتی: مامۆستا بەڵگەت بۆ ئەم بۆچوونەت هەیە؟

مامۆستاکە دوای ئەوەی کەمێك کۆکی، وتی: بەڵێ، ئیبلیس لە ئاگر درووست کراوە، دۆزەخیش ئاگرە، چۆن ئاگر ئازاری ئاگر دەدات؟؟ یاخود چۆن ئاگر، ئاگر دەسووتێنێت!

هەر یەك لە قوتابییەکان سەیری یەکتریان دەکردو بە گومان بوون لە وتەی مامۆستاکەیان، بەڵام هیچ کام لەوان جورئەتیان نەبوو، ڕووبەڕووی ببنەوە!

مامۆستاش وەکو سوارچاکێکی سەرکەوتووی مەیدانەکە، بە لە خۆباییبوونێکەوە، سەیرێکی ئامادەبووانی کرد، بەڵام بێئاگا لەوەی کە ئەو کەسەی کەمێك لە دووری قوتابییەکانی دانیشتووە، باڵووڵی حەکیمەو زۆر خۆبەکەمزانانە دەستی لە بنباڵی داناوەو بەئارامی سەیری جەنابی مامۆستا دەکات!

پاشان مامۆستاکە، دەستی بە قسەکردن کردەوەو وتی: هەروەها زۆرێك لە موسوڵمانان پێیان وایە، کە مرۆڤ ناتوانێت خودا ببینێت، باشە چۆن دەکرێت شتێك بوونی هەبێت، بەڵام نەکرێت ببینرێت؟!

جەنابی مامۆستا قسەکانی بڕیو بە هێمنی سەیرێکی قوتابییەکانی کرد، بۆئەوەی بزانێت، تا چەند قسەکانی کاریگەری لەسەر ئامادەبووان درووست کردووە، بەڵام ئەمجارە زیاتر لە جاری یەکەم، بێدەنگی باڵی بەسەر ئامادەبوواندا کێشا!

دواتر جەنابی مامۆستا، بە دەنگێکی بەرزتر هاواری کرد: «خەڵکینە، موسوڵمانان لەو بڕوایەدان کە خودا درووستکاری هەموو شتێکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، مرۆڤەکان لەو بڕوایەدان، کە مرۆڤ بکەری هەموو کارەکانە»!

ئەمەش واتە: کۆکردنەوەی ناچاریو هەڵبژاردنی ئیختیاری.. ئەو دووانەش پێکەوە ئاستەمن!

یەکێك لە ئامادەبوان وتی: ئەی تۆ لەم بارەیەوە بۆچوونت چۆنە؟ جەنابی مامۆستا وتی: بە ڕای من، هەموو شتێك بە فەرمانی خودایەو مرۆڤەکان بە ویستی خۆیان هیچ کارێك ناکەن، بەڵکو خودا فەرمانی کردووە، کە دەبێت ئەو کارە بکەن!

کاتێك مامۆستا زانی، کە قسەکانی کاریگەری کردووەتە سەر دڵو دەروونی ئامادەبووان، پێی وابوو، کە توانیویەتی قەناعەتی بە ئامادەبووان هێناوە، کە بۆچوونەکانی ڕاستو درووستن!

لەو کاتەدا، کە بێدەنگی بە تەواوی باڵی بەسەر کۆڕەکەدا کێشابوو، لە ناکاو باڵووڵ سەنگڵێکی «گڵی وەك بەرد»ی ئاڕاستەی ناوچەوانی مامۆستا کردو خوێن بە جەستەیدا هاتە خوارەوە..

بەوەش کۆڕەکە بە تەواوی شیرازەی تێکچوو، قوتابییەکانی مامۆستا زۆر پەستو تووڕەو نیگەران بوون بەم کارەی باڵووڵ، بەڵام لەبەرئەوەی دەیانزانی باڵووڵ لە نزیکانی خەلیفەیە، کەسیان جورئەتیان نەکرد، کاردانەوەیەك بنوێنن بەرامبەری! تەنها بە تووڕەبوونەوە پرسیاریان لێکرد: باڵووڵ بۆچی ئەم کارەت کرد؟ خۆئەگەر هەر کەسێکی دیکە بووایە، جگە لە تۆ، ئەوا بە سەلامەتی نەدەچووە دەرەوە!

مامۆستاش دەستی گرت بە برینەکەی سەرییەوەو سەیرێکی باڵووڵی حەکیمی کردو بە تووڕەییەوە وتی: دەڕۆم بۆ لای جەنابی خەلیفەو سکاڵات لە دژ تۆمار دەکەم؟

حەکیم بە ئارامییەوە وتی: منیش لەگەڵتدا دێم، بۆ لای جەنابی خەلیفە!

جەنابی مامۆستا بە وەڵامەکەی حەکیم سەرسام بوو، بە قوتابییەکانی گوت: شایەتیم بۆ بدەن لای خەلیفە، کە باڵووڵ سەری شکاندووم!

باڵووڵ چووە دەرەوەو کوڕەکەی بەجێهێشت، هەروەکو ئەوەی هیچی نەبیستبێت، یان هیچ شتێکی نەکردبێت!

مامۆستاش بەسەری پێچراوەوە، ڕۆیشت بۆ لای خەلیفە، کاتێك خەلیفە چاوی پێکەوت، سەری سوڕما، چونکە جەنابی مامۆستا، لای خەلیفە ڕێزو حورمەتی زۆری هەبوو!

پاشان مامۆستاکە، ڕووداوەکەی بۆ جەنابی خەلیفە گێڕایەوە، خەلیفە بەو کارەی باڵووڵ زۆر توڕەبوو.. فەرمانی کرد، کە هەر ئێستا باڵووڵ لە هەر کوێیەك هەیە، بیهێنن بۆ کۆشك!

پاسەوانەکانی خەلیفە، بە خێرایی دەستیان کرد بە گەڕان بە دوای باڵووڵدا، بەڵام بینیان ئەوا باڵووڵ، لە ڕێگەدایە بەرەو کۆشك دێت!

کاتێك حەکیم گەیشتە کۆشك، سەرەتا کۆشك بێدەنگو ئارام بوو، هیچ کەس قسەیەکی نەدەکرد، دواتر خەلیفە هاواری کرد بەسەر باڵووڵداو وتی: بۆچی سەری ئەو زانایەت شکاندووە؟

حەکیم عەباکەی لەسەر شانی داناو وتی: من ئەو کارەم نەکردووە!

مامۆستاکە وتی: چۆن نکوڵی لەو کارەت دەکەیت؟ ئەی ستەمکار، هەموو قوتابییەکانم شایەتن، کە تۆ سەرت شکاندووم!

حەکیم وتی: ببوورە ئەو ستەمەی من کردوومە چییە؟

مامۆستاکەش پێی گوت: بە سەنگڵێك سەرت شکاندم، ئازارت بەسەرم گەیاندو خوێنت لێهێنا!

پاشان ڕووی کردە قوتابییەکانیو وتی: ئایا ئێوەش شایەتی دەدەن، کە ڕووداوەکە بەو شێوەیە بوو؟!

هەموو وتیان: بەڵێ!

حەکیم وتی: تۆ دەڵێیت ئازارت بە سەرم گەیاندووە، ئایا دەتوانیت ئەو ئازارەم نیشان بدەیت؟

مامۆستاکە وتی: ئایا ئازار دەبینرێت، تا من بتوانم نیشانی تۆی بدەم؟!

حەکیم وتی: کەواتە ئازار بوونی نییە، تۆ درۆ دەکەیت، چونکە تۆ لەو باوەڕەدایت هەر شتێك نەتوانرێت ببینی، ئەوا بوونی نییە!

پاشان ئاوڕی بۆ لای قوتابییەکانی مامۆستا دایەوەو وتی: سەنگڵ ناتوانێت ئازار بە مامۆستاکەتان بگەیەنێت، چونکە مرۆڤ لە گڵ درووستکراوە، بەردیش لە گڵە، ئیدی چۆن گڵ ئازار بە گڵ دەگەیەنێت!

ئەو کات مامۆستاکە زانی، کە باڵووڵ دەیەوێت، جەنگی بیروباوەڕی لەگەڵدا بکات، بەبێ هۆ ئەو کارەی نەکردووە!

پاشان حەکیم ڕووی کردە خەلیفەو وتی: جەنابی مامۆستا پێی وایە، کە هەر کارێك مرۆڤ ئەنجامی دەدات، بە دەست خۆی نییە، بەڵکو ئەوە فەرمانێکی ناچارییەو خودا فەرمانی کردووەو ئەویش جێبەجێی دەکات! کەواتە منیش تاوانم نییە، چونکە ئەو کارەم بە ویستی خۆم نەکردووە!

خەلیفە بە وەڵامەکانی حەکیم سەرسام بوو، هیچ قسەیەکی بۆ گوتن نەبوو!

ئەو کات جەنابی مامۆستا سەرزەنشتی خۆی کردو بە خۆی گوت: هەموو ئەوەی ڕووی دا، بە هۆی بیروبۆچوونی خۆمەوە بوو!

حەکیم بە سەنگڵێك سەرجەم بیربۆچوونەکانی وەڵامدایەوە، تێی گەیاند، کە مرۆڤ لە گڵە، ئەوەتا بە گڵیش ئازاری دەگات، پێی گوت، کە ئازار، بوونی هەیەو ناشتوانرێت ببینرێت، هەروەها پێی گوت: مرۆڤ کارو کردەوەکانی بە دەست خۆیەتیو ناچار نەکراوە، کە کردەوەی خراپ بکات! بەڵکو سەرپشك کراوە لەوەی؛ ئایا کردەوەی چاك بکات، یان خراپ!

ڕۆژێکیـــان باڵووڵی حەکیـــم بەنێو یەکێك لە کۆڵانەکانی شـــاری بەغدادا دەگەڕا، چاوی کەوت بە کۆمەڵە کەسـێك، کە سـەرقاڵی دروستکردنی مزگەوت بوون، سڵاوی لێکـردنو کەمێك لـە کارەکەیان ڕاماو پاشـان چووە نێـو مزگەوتەکەوە، بینی بایەخێکی ئەوتۆ نادرێت بە شـێوەو شـێوازی جوانکاریو شـێوەی دیوارو سـەقفو دروستکردنی ناو مزگەوتەکە، حەکیم بە سەرسوڕمانەوە لە مزگەوتەکەی ڕوانی، وەکو ئەوەی شتێك لە دەروونی خۆی حەشار دابێت، پاشان ڕۆیشتە دەرەوەی مزگەوتەکەو سەیرێکی ڕووکاری دەرەوەی مزگەتەکەی کرد، تابلۆیەکی دارینی بینی کە بە دیواری مزگەوتەکەدا هەڵواسـرابوو، لەسەر تابلۆکە نوسـرابوو، مزگەوتی «شێخ ......». ئەم پیاوە حەزی لە ناوبانگـو شۆرەتو ناودەرکردن دەکرد، حەزی دەکرد خەڵکی بە کارە چاکەکانی ئاشنا بن، حەکیم بە باشی بە ڕەفتارو ئاکارەکانی ئەم پیاوە ئاشنابوو!

حەکیـم کەوتە بیرکردنەوەو خەیاڵی ئەو مزگەوتەو تابلۆی سـەردیوارەکەی، بە سـەیرکردنی باری سەرشـانی قورس دەبوو، لەشـی دادەهێزرا، تـەواو نیگەرانی بە ڕوخسـارییەوە دیاربـوو، لەبەرئەوە ئـاوڕی دایەوە بۆ لای ئامادەبـووانو چاوی بە «شـێخ ......» کەوت، بینی وا پێدەکەنێتو زۆر شـادومانە، حەکیم سـەیرێکی کردو دەستپێشـخەری کردو وتی: «السـلام علیکم»، پاشان وتی: ئەم مزگەوتە مزگەوتێکی گەورەیەو شێوەیەکی جوانی هەیە.

«شـێخ ......» بـەرەو لای مامۆسـتای مزگەوتەکە ڕۆیشـت، حەکیمیش لەگەڵیدا ڕۆیشت، پاشان وتی: خودا لێتان قبوڵ بکات.

دواتـر حەکیم وتی: دەمەوێت پرسـیارێکت لێ بکەم، بەڵام نازانم پرسـیارەکەم، ژیرانەیە، یاخود نا!!

شـێخ وتی: کێشەیەك نییە، بپرسـە هەوڵەیەم وەڵامت بدەمەوە، باڵووڵ سەرێکی ڕاوەشاندو وتی: بێگومان وایە، پاشان کەمێك بێدەنگ بوو، دواتر پرسی: ئێوە بۆ کێ ئەم مزگەوتە دروست دەکەن؟

هەرچەندە شـێخ چاوەڕێی ئەمجۆرە پرسـیارەی نەدەکرد، پاشـان کەمێك بیری

کــردەوەو دواتر بیرۆکەیەك بە خەیاڵیدا هاتو لەبەر خۆیەوە وتی: باڵووڵ پیاوێکی شێتە، لەبەرئەوە پێویست ناکات بەو جۆرە پرسیارەی سەرسامو نیگەران بم، وەڵامی دایەوەو وتی: ئایا دروستکردنی مزگەوت بۆ جگە لە خودا دروست دەکرێت؟؟

حەکیم وتی: بێگومــان هەروەکو ئەوەی کە بەڕێزتان دەفەرموون، خودای گەورە هیچ کارێك بێ پاداشت ناکات، بێگومان خودای گەورە پاداشتەکەی لە بیرناکات!

دواتر شــێخ هیچ قســەیەکی نەکرد، چونکە تێنەگەیشت کە حەکیم چی دەوێتو بۆچی ئەو پرسیارەی کرد، لەبەرئەوە ڕۆیشت تا ئەو کاتەی لە حەکیم دوورکەوتەوە!

بــۆ ڕۆژی دواتــر، شــێخ لەبەردەمی مزگەوتەکە بە دەنگی بــەرز هاواری کرد، بە جۆرێك کە هەموو ئەو کەسانەی بەلای مزگەوتەکەدا گوزەریان دەکرد، دەنگی شێخیان دەبیست، دەیگوت: ئەی خەڵکینە، سەیربکەنو بزانن باڵووڵ چی کردووە، ئەو تابلۆیەکی لەســەر دیواری ئەم مزگەوتە هەڵواسیوەو لەســەری نوسیوە، مزگەوتی باڵووڵ، وەرن، بــە چاوی خۆتان ببیننو تابلۆکە بخوێننەوە، ئــەی خەڵکینە هەمووتان دەزانن کە باڵووڵ دینارێکی بۆ دروستکردنی ئەم مزگەوتە خەرج نەکردووە، بەردێکی نەخستۆتە ســەر بەردێك، هەمووتان دەزانن ئەم مزگەوتەم بە ماڵو سامانی خۆم دروستکردووە، هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم، ڕۆژێك لە ڕۆژان باڵووڵ وەها کارێك بکات، ئیدی نازانم باڵووڵ چۆن توانیویەتی، وەها کارێك ئەنجام بدات، کابرا ئەوەندە هاواری کرد، قوڕگی نوسا، سەری دایە ئازار.. دواتر هەرچۆنێك بێت، هاتەوە سەرخۆو بڵێسەی توڕەییەکەی خامۆش بوو، ئارام بووەوەو لەبەرخۆیەوە وتی: باڵووڵ کابرایەکی شــێتە، پێویست بە نیگەرانی ناکات!

بەڵام زۆری پێ نەچوو، دووبارە گڕی توڕەیی بەرزبووەوەو وتی: شێتیش سنوری هەیە، ئایا خەڵکی نازانن کێ ئەم مزگەوتەی دروســتکردووە، شێتەکان هەر ئەمجۆرە کارانەیان لێ چاوەڕێ دەکرێت، ئێســتا باڵووڵ دەیەوێت ئەم مزگەوتە بکرێت بەناوی ئەوەوە، بەڵام دەبێت وانەیەکی فێربکەم هەرگیز لە یادی نەچێت، هیچ کات جارێکی دیکە نەتوانێت کاری لەو شێوەیە ئەنجام بدات..

هەموو ئەو کەسـانەی کاریان لـە مزگەوتەکەدا دەکرد لە دەوری جەنابی شـێخ کۆببوونـەوە، بۆئـەوەی گوێیان لە قسـەکانی بێت، هەموو ئامادەبـووان هەقیان بە جەنابی شـێخ دەدا، هەمووان ئەویان بە حەق دەزانیو باڵووڵییان بە سـتەمکار لە قەڵەم دەدا.. لە ناکاو هاواری کرد بەسەر کرێکارەکانیداو وتی: بڕۆن لە هەر شوێنێك هەیـە باڵووڵم بۆ بدۆزنـەوە، بۆئـەوەی وانەیەکی فێربکەم، پەندێکـی دابدەم، کە هەرگیز جارێکی دیکە زات نەکات مافی کەسانی دیکە پێشێل بکات..

کرێـکارەکان بەپەلە ڕۆیشـتن، بەتایبەت ئەوانەی کە حەزیـان دەکرد خۆیان لە کارکـردن بدزنـەوە، وتیان جەنابی شـێخ ئێمـە لەگەڵ تۆداین، بۆ گـەڕان بە دوای باڵووڵدا..

هەریەك لەوان ڕوویان کردە شوێنێك بۆ گەڕان بە دوای باڵووڵدا، زۆری پێنەچوو توانیان باڵووڵ بدۆزنەوە، هێنایان بەرەو لای مزگەوتەکەو بۆ بەردەمی جەنابی شێخ، کاتێك شێخ چاوی کەوت بە باڵووڵ، وەخت بوو، چاوەکانی دەرپەڕن، بە دەنگی بەرز بەسەریدا هاواری کرد، ئەی شێت بۆچی ئەو کارەت کردووە؟

باڵووڵیش زۆر بە ئارامیو لەسـەرخۆییەوە، سەیرێکی ئامادەبووانی کردو وتی: چ کارێکم کردووە، کە بەڕێزتانی ئاوەها تووڕە کردووە؟

شـێخ لـە تووڕەییدا چاوەکانی سـووربببوون، وتی: دەزانم تـۆ ناوێریت کە دان بە تاوانەکەتدا بنێیت، لەبەردەم ئەم هەموو خەڵکەدا.. ئایا ئەمە ڕاستە؟

باڵووڵ وەڵامی دایەوەو وتی: ئایا تۆ تاوانێکت کردووە؟ ئەی تاوانی من چییە؟

جەنابی شـێخ دەستیکرد بە پێکەنین، بەڵام پێکەنینێك لێوان لێو لە تووڕەیی، بە دەسـتەکانی ئاماژەیەکی بۆ تابلۆی مزگەوتەکە کردو وتی: جگە لە تۆ کێ دەتوانێت ناوی خۆی لەسەر مزگەوتێك بنوسێت، کە کەسانی دیکە دروستیان کردووە؟!

باڵووڵ سـەیرێکی تابلۆی مزگەوتەکەی کردو پاشـان چاوی لەسەر تابلۆکە لابرد، هەروەکـو ئەوەی هیچـی نەبینیبێتو هیـچ نەبوبێت، بە ئارامییـەوە وتی: ئەگەر مەبەستت ئەو تابلۆیە بێت، ئەوە بەڵێ، من ئەو کارەم کردووە!

بە بیستنی ئەو وەڵامە جەنابی شێخ هێندەی تر، ڕقو تووڕەیی بەرزبووەوە، سات دوای سات تووڕەبوونی زیادی دەکرد، تا هاواری کرد بەسەر باڵووڵداو وتی: ئایا تۆ ئەم مزگەوتەت دروستکردووە، وا ناوی خۆت لەسەر نووسیوە!

باڵووڵ جارێکی دیکە سەیرێکی تابلۆکەی کردەوەو وەڵامی دایەوە، نەخێر من ئەم مزگەوتەم دروســـت نەکردووە.. بەڵکو من تەنها ئەو تابلۆیەم دروستکردووە کە ناوی منی لەسەر نووسراوە..

شێخ یەخەی باڵووڵی گرتو سەیرێکی خەڵکەکەی کردو وتی: سەیرکەن، ئەو دانی نا بە تاوانەکەیدا، هەموو ئامادەبووان بە دەنگی بەرز هاواریان کرد، باڵووڵ دانی بە تاوانەکەیـــدا نا، هەموو چاوەڕێیان دەکرد باڵووڵ شـــتێ بڵێت، بەڵام باڵووڵ ئاماژەی کرد بۆ ئامادەبووان کە بێدەنگبن، هەمووان بێدەنگ بوون، باڵووڵ زۆر ئازایانە ڕووی کردە جەنابی شـــێخو وتی: جەنابی شێخ، پرسیارێکت لێدەکەم.. حەزدەکەم بەڕاستی وەڵامم بدەیتەوە.

شێخ وتی: بۆچی دەبێت درۆ بکەم؟؟

باڵووڵ وتی: دوێنێ، هەر لەم شـــوێنەدا پێتگەیشتم، کەمێك قسەم لەگەڵدا کردی، پاشان پرسیارم لێکردی، ئەم مزگەوتە بۆ کێ دروست دەکەیت؟

وتت: تەنها لەبەر خاتری خودا!

پاشـــان باڵووڵ خەندەیەکی کردو وتی: خودا دەزانێت، کە تۆ بۆ خودا دروســـتت کردووە، یان نا؟

شێخ بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە، من نامەوێت چیدی درێژە بە قسەکردن بدەم لەگەڵ تۆدا، دەڵێم بەڵێ، خودای گەورە خۆی دەزانێت!

باڵووڵ کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان وتی: جەنابی شێخ، ئەگەر تۆ لەبەر خودا ئەم مزگەوتەت دروستکردووە، ئەوە هیچ زیانێکی نییە ئەگەر مزگەوتەکە بە ناوی تۆوە بێت، یاخود بە ناوی کەســـێکی دیکەوە، بەڵام من دەزانم تۆ تەنها لەبەرخاتری ناوو ناوبانگو شـــۆرەتت ئەم مزگەوتە دروســـت دەکەیت، بەمەش پاداشتو ماندووبوونت

لای خودا بەفیرۆ دەچێت..

چونکـــە خودای گەورە دەزانێت کە تۆ ئەم مزگەوتەت دروســـتکردووە، ئەگەرچی بەناوی تۆشەوە نەبێت، بەڵام ئەوە خەڵکییە لێیان تێکدەچێتو نازانن ئەم مزگەوتە تۆ دروستت کردوە، ئەگەر بەناوی تۆوە نەبێت، کەواتە ئەم هەموو خۆ تورەکردنەی تـــۆ لەبەر خاتـــری خەڵکی بوو، نەك لەبەرخاتری خودا.. تـــەواوی ئامادەبووان، بەم وەڵامەی باڵوولی حەکیم سەرسام بوون، هیچ کەس لەوان قسەیەکی بۆ وتن نەبوو!

باڵوولّ وتی: ئێســـتا جەنابی شـــێخ دەمەوێت، ئەو تابلۆیـــە دابگرم کە ناوی منی لەسەرەو بە دیواری مزگەوتەکەوەیە!

بە دەم قسەکردنەوە بەرەو ڕووی تابلۆکە دەڕۆیشت.. جەنابی شێخ ویستی قسەیەك بکات، بەڵام وشەکانی تێکئاڵاو هیچ شتێکی پێ نەوترا!

باڵوولّ هەنگاوی بەرەو تابلۆکە دەنا، بەڵام گەڕایەوە، ئاوڕێکی بۆ لای ئامادەبووان دایەوەو وتی: بەم کارەم ویســـتم ڕاســـتتیەك ئاشـــکرا بکەم، ئێوەش باش بزانن هەر کارێـــك کـــە تەنها لەبەر ڕەزامەنـــدی خودای گەورە ئەنجام بدرێـــت، ئەوا بۆچوونو قســـەی خەڵکی هیچ زیانێکتان پێناگەیەنێت، چونکە خوای گەورە بە سەرجەم کارو کردەوەکان ئاگادارە، دەزانێت کێ ئەو کارەی کردووە!

پاشان ڕۆیشت بۆ لێکردنەوەی تابلۆکە..

حەکیم بەم کارەی وانەیەکی گەورەی فێری شێخو ئامادبووانو هەموو ئەو کەسانە کرد، کە وا دەزانن دەبێت ناوەکانیان لەسەر کارەکانیان بنەخشێنرێت!

ئەگـــەر ناوەکەت لەســـەر دیواری مزگەوتەکە نەنوســـرێت، تەنهـــا خەڵکی نازانن کە کێ ئەو مزگەوتەی دروســـت کردووە، خودای گەورە باش دەزانێت کێ دروســـتی کـــردووەو لە پێناوی چیدا دروســـتی کردووە، ئایا بۆ ناوبانگـــو شـــۆرەت ئەو کارەی کردووە، یان تەنها لەبەر ڕەزامەندی خودا!



# پەرێنەوە بەسەر پردا

باڵوولی حەکیم وەکو نەریتی هەمیشــەیی خۆی، هەندێجار دەڕۆیشت بۆ گۆڕستانو لەوێ دادەنیشتو بیری لەو ساتو کاتانە دەکردەوە کە مرۆڤ بەبێ ویستی خۆی بەرەو ئەو ماڵە دەڕواتو دەبێتە مەنزڵگای هەمیشــەیی، پاش تێڕامانو بیرکردنەوە لەو ساتە وەختە سەختە، نزای بۆ مردووەکان دەکردو دەگەڕایەوە ئاوایی.

ڕۆژێکیان باڵوولی حەکیم سەردانی گۆڕستان دەکات، لەو ڕۆژەدا خەلیفە هارون بە مەبەســتی ڕاوشــکار دەچێتە دەرەوەی شار، لە ڕێگەدا بە لای گۆڕستانەکەدا تێپەڕی،

چاوی کەوت بە بالوولی حەکیم کە لەسـەر گۆڕسـتانەکە دانیشـتبوو.. لێی پرسـی: بالووڵ ئەوە لێرە چی دەکەیت؟

بالووڵ وەڵامی دایەوەو وتی: هاتووم بۆ لای خەڵکانێك کە هەرگیز غەیبەتی کەس ناکەن، ئازارم نادەنو هیچ داواکارییەکیشیان لە من نییە.. ئێرە ماڵی هەمووانە!

خەلیفە لە ئەسـپەکەی دابـەزیو بەرەو ڕووی بالووڵ ڕۆیشـت.. وتی: دەمەوێت پرسیارێکت لێ بکەم؟

بالووڵ گوتی: ئەگەر زانیم وەڵامت دەدەمەوە..

خەلیفە لە تەنیشـتی ئەو گۆڕە ڕاوەسـتا کە بالووڵ لێی دانیشتبوو، وتی: هەواڵم دەربارەی پردی صراتو ڕۆژیی دوایی بدەرێ؟!

بالووڵ هەڵسـایە سـەرپێو لە تەنیشـتی خەلیفەوە ڕاوەسـتا، فاچێکی کێشا بە زەوییەکەداو وتی: بە پاسەوانەکانت بڵێ بالێرەدا ئاگرێك بکەنەوە.. خەلیفە فەرمانی کـرد کە دار کۆبکەنـەوەو ئاگرێك بکەنەوە، کاتێك ئاگرەکەیـان کردەوە، بالووڵ بە خەلیفە هارونی گوت: فەرمان بکە سـاجێك بخەنە سـەر ئاگرەکە، فەرمانی خەلیفە جێبەجـێ کرا، کاتێـك ئاگرەکە بڵێسـەو گەرمییەکەی زیادی کردو سـاجەکەی بە تەواوی گەرم کرد، بالووڵ بە خەلیفە هارونی گوت: من لەسەر ئەو ساجە ڕادەوەستم، خۆم دەناسێنمو باس لەوە دەکەم کە دەیخۆمو باس لەو پۆشاکە دەکەم کە دەیپۆشم، ئەگەر تەواو بووم لە قسـەکانم تۆ لەوێ ڕابووەسـتەو هەمان ئەو کارە بکە کە من ئەنجامی دەدەم..

خەلیفە بەسەرسامییەوە وتی: نازانم ئەوە چ مانایەکی هەیە.. دەتوانیت پێم بڵێی ئەوە سوودی چییە؟

بالـووڵ وتی: تۆ پرسـیارت کرد، گـوێ بگرە بۆ وەڵامەکەی، ئـەوەی پێت دەڵێم ئەنجامی بدە..

خەلیفە هارون ترسـا لەوەی لەسـەر ساجەکە ڕابووەسـتێ، هەوڵی دەدا لە نیازی بالووڵ تێبگات، بەڵام بالووڵ پێی گوت: کە دەبێت سەرەتا ئەو کارە ئەنجام بدات..

لە قسەکانی هاروندا بۆنو بەرامەی ترسو تێکەڵ بە هەڕەشە بەدی دەکرا..

باڵووڵ وتی: زۆرباشــە ســەرەتا من ئەو کارە ئەنجام دەدەم، حەکیم چووە ســەر ســاجەکەو ڕاوەستاو وتی: من باڵوولم، خواردنم خورماو نانی جۆو سرکەیە، بەرگو پۆشــاکم لە خورییە، ئەو قســانەی کردو هاتە خوارەوە، پێلاوەکانی بە تەواوی گەرم نەببوو، کە لە قســەکانی بووەوەو هاتە خوارەوە.. چونکە بە کەمتر لە دێڕێك خۆی ناساند!

ئێســتا نــۆرەی خەلیفە هارونە دەســتیان گرتو چوونە ژێــر باڵییەوە، ئەوانەی دەوروبەری زۆر بەپەرۆشــەوە بۆیان دەڕوانی، هەناســەکانی خێرا لێیان دەدا، ئارەق بەناوچەوانیدا دەهاتە خوارەوە، لە کۆتاییدا بە خێرایی چووە ســەر ساجەکە، بەلام نەیتوانی لە یەك چرکە زیاتر خۆی بگرێت: بەپەلە وتی من هارونمو خۆی فڕێدایە دەرەوە.. چواردەورەکەی نەیان دەوێرا لە ترســا پێبکەننو لە ناخیشەوە ژانیان کردبوو لــە پێکەنینــا، هەوڵیــان دەدا کۆنترۆڵی خۆیان بکەنو دەســتیان بــە دەمی خۆیانەوە گرتبوو.. خەلیفە هارون نەیتوانی لەبەردەم ئەو خەڵکەدا لەســەر پێیەکانی ڕاوەســتێ، بە تووڕەییەوە بە باڵووڵی گوت: ئێستا پێم بڵێ مەبەستت چی بوو لەم کارە؟

باڵــووڵ خەندەیەکــی کردو وتی: بزانــە کە ڕۆژی دوایی بەو شــێوەیە، ئەوانەی کــە پشــتیان لە دنیــا هەڵکردووەو گوێ نادەن بە ماڵو ســامانو زێــڕو زیو دارایی، بە خۆشــییەکانی دنیا، زۆر بە ئارامیو هێمنیو بە ئاســانی بەســەر پردی صیراتدا دەپەڕنەوە، ئەوەش کە وابەســتەیە بە دنیاو ماڵو ســامانەوە، ئاخیرەتی پشــتگوێ خســتووە، توانای پەڕینەوەی بەســەر پردی صراتدا نییە، هەر لەو کاتەی کە دەگاتە سەر پردەکە دەکەوێتە خوارەوە..

حەکیم بە دوو قســە خۆی ناســاند، «باڵوولم، خواردنم ســرکەو جۆیە، پۆشاکم خورییــە.. بــەلام دونیا ویســتان ناتوانن بە ســەدان ڕســتە وەســفی نیعمەتەکانو خۆشگوزەرانییەکانیان بکەن»!




# دزی لە پێناوی برسێتیدا

لە هەموو سەردەمێکدا کەسانی هەژارو نەدار بوونیان هەبووە، زۆرجار مرۆڤی هەژار ناچار بە هەندێك کار دەبێت کە هەژارییەکەی بووەتە هۆی ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدات، دەگێڕنەوە لە سەردەمی هارونە ڕەشید یەکێك لە هەژاران کە تەنها کولێرەیەکی لە ماڵەکەیاندا شك نەبردووە، بۆئەوەی سکی برسی منداڵەکانی پێ تێربکات، ڕۆژێك برسـێتی زۆریان بۆ دەهێنێ‌و منداڵەکانی لە برسانا دەگرین‌و دەناڵێنن، بەڵام بێچارە باوکیان شـتێکی لە دەسـت نایە بۆیانی ئەنجام بدات، کولێرەیەکی دەست نەدەکەوت تـا منداڵەکانی لە لێواری مەرگ ڕزگار بـکات، دەبێت چ تراژیدیایەك بێت، بە چاوی

خۆت ببینی جگەرگۆشـــەکانت وا لە برســـانا گیان ئەدەن، ناڵەو ئەســـرینیان ئاگر لە جگەری مرۆڤ بەردەدات، لەو ســـاتەی لە بیری تێرکردنی سکی منداڵەکانیدابوو، لەو ســـاتەی لە بیری گۆڕینی گریانو ناڵەی منداڵەکانی بوو بە خەندەو خۆشـــی، هەواڵی بیست کە کاروانی جەنابی خەلیفە بە ڕێگاوەیە بەرەو شاری بەغداد، برسێتیو ناڵەو هـــاواری منداڵەکانـــی، ناچاری کرد کە بیر لە ڕێگە چارەیەك بکاتەوە بۆ ڕزگارکردنی منداڵەکانـــی لە لێـــواری مەرگ، هەرچۆنێك بێـــت خۆی گەیانـــدە کاروانەکەو بڕێك خۆراکیی لە کاروانەکە دزیو بەرەو ماڵ گەڕایەوە، توانی بۆ ماوەیەك منداڵەکانی لە برسێتی ڕزگار بکات..

لـــە لایەکی دیکەوە هەواڵی دزیکردن لە کاروانەکە گەیشـــتەوە بە خەلیفە هارون، خەلیفە بەو کارە زۆر توڕەبوو، فەرمانی کرد کە ڕێوشوێنی توند بگرنە بەرو دەست بکەن بە گەڕان بە دوای ئەو کەســـەدا کـــە جورئەتی کردووە لە کاروانەکەی خەلیفە دزی بکات، هەرچی زووە دەســـتگیری بکەنو بیهێننە کۆشـــکی خەلیفە، تا بە توندی سزای بدات!

هەژاری بەســـەزمان هەواڵی بیست کە خەلیفە فەرمانی داوە کە هەموو جێگەیەك بگەڕێـــن، بۆ دۆزینـــەوەی ئەنجامدەری ئەو کارە، لەبەرئەوە ترســـا لەوەی تاوانەکەی ئاشـــکراببێتو دەســـتگیری بکـــەن، بۆئـــەوەی لەو تەنگژەیـــە ڕزگاری ببێـــت کەوتە بیرکردنەوە، تا دواجار بە بیریدا هات کە باشـــترین کەس بۆ چارەســـەری کێشەکەی باڵووڵـــی حەکیمـــە، هەربۆیە بەرەو لای حەکیم ملی ڕێگـــەی گرتەبەر، کاتێك چاوی بە حەکیم کەوت، دوای ســـڵاوو هەواڵپرسین، تەواوی بەســـەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.. حەکیم پێشنیاری بۆ کرد کە بە قاچەکانی خۆی بەرەو کۆشکی خەلیفە بەڕێبکەوێتو دان بە تاوانەکەیدا بنێت، بەڵێنی پێدا کە هاوکاری بکاتو ڕێگە نەدات خەلیفە سزای بدات، هەرچەندە یەك لە وەزیرەکانی خەلیفە بە هۆی ئەو ڕێزو پلەو پایەی حەکیم هەیبوو، لای خەلیفە، زۆر دژایەتی دەکردو خۆشی نەدەویست.

دواجـــار کابـــرای هەژار بەرەو کۆشـــك بەڕێکـــەوت، لەبەردەم خەلیفـــەدا دانی بە

تاوانەکەیــدا نا، کاتێك خەلیفــە هارون وتەکانی کابرای هەژاری بیســت، ڕاوێژی بە وەزیرەکەی کردو وتی: چ سزایەك بەسەر ئەم کەسەدا بسەپێنین، کە دزی لە کاروانی خەلیفە کردووە؟

وەزیر وتی: فەرمان بدە تا دەستی ببڕن!!

خەلیفە فەرمانی دا کە دەســتی کابرای هەژار ببڕن، تا جارێکی دیکە هیچ کەس جورئەت نەکات، دزی لە کاروانی خەلیفەو ماڵو سامانی بکات..

لەو کاتەدا حەکیم وەدەرکەوت، هەر کە گوێبیســتی فەرمانەکەی خەلیفە بوو، بە توندی ڕەخنەی لە فەرمانەکە گرت!

خەلیفە وتی: ئایا تۆ بڕیارێکی باشترو دادوەرانەترت لایە؟

حەکیم وتی: بێگومان، بە ڕای من دز دوو جۆرە:-

جۆری یەکەم: ئەو کەســەیە کە دزی لە پیشــەکەی دەکات، «واتە پیشــەکەی بۆ تاوانو خراپەو چەوسانەوە بەکاردێنێت»، ئەو کەسە دەبێت دەستی ببڕدرێت، لە کاتی قسەکردنەکەیدا حەکیم بە چاوەکانی ئاماژەی بۆ جەنابی وەزیر دەکرد.

جۆری دووەم: ئەو کەسەیە کە دزی دەکات لەبەر هەژاریو نەداری، لەبەر پێویستیو برسێتی، ئەو کەسە نابێت سزا بدرێت، بەڵکو دەبێت لە بری ئەو سزای فەرمانڕەوای وڵات بدرێــت، لەو کاتەدا حەکیم بە چاوەکانی ســەیری خەلیفــەی دەکرد، (چونکە مرۆڤەکان کاتێك برســێتی پاڵیان پێوە دەنێت بۆ تاوانکردن، زێتر لە خۆیان پادشای وڵات تاوانبارە، چونکە نابێت پاشای وڵات ئەوەندە بێ ئاگا بێت، کە هاوڵاتییەکانی لە برسانا لە لێواری مەرگ بن)!

قســەکانی حەکیم زۆر کاری کردە ســەر جەنابی خەلیفــە، لەبەرئەوە بڕیاری دا، هەژارەکە ئازاد بکەنو چەندین ســەر مەڕو ماڵاتیشــی بە دیاری پێببەخشــن، تا لە برســێتیو هەژاری، خــۆیو خێزانەکەی ڕزگارییان ببێت.. بۆئــەوەی ژیانو گوزەرانی خۆیو منداڵەکانی پێ بەڕێوەبەرێت، تا جارێکی دیکە ناچار نەبێت پەنا بۆ دزیکردن بەرێت، لە پێناو ڕزگارکردنی منداڵەکانی لە برسێتی..



# موچەی مانگانەی بالوول

حەکیم بە هۆی ئەو دانایی زانایی‌و لێهاتوویەی کە هەیبووە، جگە لەوەی خەلیفە هـارون مافی ئەوەی داوەتێ کە لە هەر کاتو سـاتێکداو هەر وەختێك حەکیم حەز بکات، بێ پرس‌و مۆڵەت وەرگرتن لە پاسـەوانەکانی بـەردەگاو بێئەوەی هیچ کەس بتوانێت ڕێگری لێ بکات بۆی هەیە بڕواتە کۆشـکی خەلیفەو لە هەر شـوێنێك پێی خۆشـبێت دابنیشێت، زۆرجار ئەگەر چەند ڕۆژێك بالوولی حەکیم سەردانی کۆشکی نەکردبا، ئەوا خەلیفە نێردراوی دەنارد بە دوایداو داوای دەکرد کە سەردانی بکات..

ڕۆژێکیان حەکیم بە مەبەستی دیداری خەلیفە بەرەو کۆشکی خەلیفە بەڕێکەوت، کاتێك گەیشـتە کۆشـکو چووە ژوورەوە بۆ لای جەنابی خەلیفە، دوای بەخێرهاتن‌و هـەواڵ پرسـین جەنابـی خەلیفـە هارون بـە بالوولـی حەکیمی گـوت: دەتەوێت یارمەتییەکت بۆ ببڕمەوەو مانگانە لە خەزێنەی دەوڵەت ئەوەندەت پێبدەن کە ئاتاج

بە پارەو سامانی هیچ کەس نەبیت؟ بۆئەوەی خەیاڵت ئاسوودەبێو بیر لە سامانو دارایی نەکەیتەوە، چاوت لە دەستی هیچ کەس نەبێو بێ نیاز بیت لە ماڵو سامانی خەڵکی.. هەروەها بۆئەوەی پێویستت بە کارو کاسبی نەبێت.. «بێگومان خەلیفە ویستویەتی حەکیم سەرقاڵی خوداپەرستیو کاری حەکیمانەی خۆی بێت، جگە لەوە بە هیچ شتێکی دیکەوە سەرقاڵ نەبێت».. ئەمە ئەو پلەو پایەیە کە زۆرێك لە خەڵکی لە کۆنەوە تا ئێستا بە دوایدا وێڵنو دەیانەوێت لە لایەن کاربەدەستانەوە مووچەیەکیان بۆ ببڕنەوە، تا بتوانن ئاسوودەو دوور لە خەمی پەیداکردنی بژێوی، ژیان بگوزەرێنن، زۆرێك لە خەڵکی ئاواتیان ئەوەیە بگەنە کەسانی بەرپرسو ئەو پلەو پایە بە دەستبهێنن.. بەڵام دونیا نەویستانو هیممەتبەرزان هەرگیز موچەو کارێك قبوڵ ناکەن کە بەبێ ماندووبوونو ئارەقەی نێوچەوانو بێ بەرامبەرو بێئەوەی شایستە بن، مووچە وەربگرن.. بابزانین هەڵوێستی حەکیم لەمبارەیەوە چی بووە؟

حەکیمی دونیا نەویست زۆر هیممەتبەرزانە گوتی: ئەگەر لەم کارەدا سێ عەیب نەبوایە ڕازی دەبووم.. خەلیفە گوتی: ئەو سێ عەیبە چییە؟

حەکیم وتی:

یەکەم: تۆ نازانی من پێویستم بە چییە، تا ئەوەم پێببەخشی کە من پێوستمە.

دووەم: تۆ نازانی من چ کاتێك پێویستم بە یارمەتی هەیە، تا لەو کاتانەدا موچەم پێ بدەی کە من پێویستمە..

سێیەم: تۆ نازانیت من ئەو بڕەی پێویستمە چەندە، تا ئەو ئەندازەیەم پێببەخشی کە من پێویستمە.

بەڵام خودای گەورە کە ڕۆزی دەری هەمووانە، دەزانێت من ئاتاجم بە چییە، دەزانێت من چ کاتێك پێویستم بە یارمەتییە، دەشزانێت من چەندم پێویستە..

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، خودای گەورە هەرگیز بە هۆی سەرپێچی فەرمانەکانییەوە ڕۆزیو یارمەتی خۆی بۆ بەندەکانی نابڕێت.. بەڵام تۆ هەر کات من تاوانێکم دەرحەق کردیت، تورە دەبیتو هاوکاریو یارمەتییەکانت دەگریتەوە! ئەوەش سروشتی مرۆڤە..

# باڵوڵ و عەبدوڵای کوڕی موبارەک

ڕۆژێك عەبدوڵای کوڕی موبارەك بۆ دیتنی باڵووڵی حەکیمو دانا، بەرەو دەرەوەی شار بەڕێکەوت، (چونکە باڵووڵ بەشێکی زۆری کاتەکانی لە دەرەوەی شارو گۆڕستانو تەنیایـی لـە پێناو بیرکردنەوە لە ڕۆژی فەصڵانو گەڕانەوە بۆ دونیای هەمیشـەیی بەسـەردەبرد)، کاتێك عەبدوڵا گەیشـت بە باڵووڵی حەکیم، بینی وا سەرقاڵی زیکرو یادی خودای گەورەیە..

عەبدوڵا پاش سـڵاوکردنو هەواڵپرسـین، داوای لێکردو وتـی: حەکیم هاتووم تا ئامۆژگاریـم بکەیـت، ئامۆژگارییەکم بکـە کە بەدرێژایی تەمەنم لـە تاوانو خراپە بەدووربم.

بەڵام حەکیم بێ وەڵام بوو، هیچ شـتێکی پێ نەگوت، عەبدوڵا گوتی: بۆچی هیچ ناڵێیت؟

حەکیم وتی: ئەگەر چوار مەرجم لەگەڵدا بکەیتو بەڵێنم پێ بدەیت پابەند بیت بەو چوا مەرجەوە، ئەو کات ئامۆژگاریت دەکەم..

عەبدوڵا گوتی: ئەو چوار مەرجە چییە کە دەبێت من پێیانەوە پابەندبم!

حەکیم وتی:

یەکەم: ئەگەر تاوانت کرد، ئیدی لە ڕۆزی خودا مەخۆ!

عەبدوڵا وتی: ئەگەر لە ڕۆزی خودا نەخۆم، دەبێت لە ڕۆزی چ کەسێك بخۆم؟

حەکیم وتی: چۆن لە ڕۆزی خودای گەورە دەخۆیتو سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەیت؟

دووەم: ئەو کاتەی دەتەوێت تاوان بکەیت، لە موڵکی خودای گەورە بڕۆرە دەرەوە!

عەبدوڵا وتی: هەموو شوێنێکو تەواوی ئاسمانەکانو زەوی، موڵکی خودان، بۆ کوێ بڕۆم؟

حەکیم وتی: ئەوە چ چاوەڕوویەکە، کە لە ڕۆزی خودا بخۆیتو لە موڵکی ئەودا بژیت، لە هەمان کاتدا سەرپێچی فەرمانەکانی خودا بکەیت!

سێیەم: ئەو کاتەی ویستت تاوانێك ئەنجام بدەیت، بڕۆ بۆ جێگەیەك کە خودای گەورە نەتبینێت!

عەبدوڵا وتی: خودای گەورە لە هەموو جێگەیەك من دەبینێت، هیچ شوێنێك نییە لە ئەو پەنهان بێت، ئیدی من بۆ کوێ بڕۆم؟

حەکیم وتی: کەواتە چ چاوەڕوویەکە کە لە ڕۆزی خودا بخۆیت، لە موڵکی ئەودا بژیت، لە کاتێکدا ئەو دەتبینێت، ئیدی چۆن ڕووت دێت سەرپێچی فەرمانەکانی بکەیت؟

چوارەم: ئەو کاتەی فریشتەی گیانکێشان هات بۆلات، بۆئەوەی ڕۆحت بکێشێت، داوای مۆڵەتی لێ بکەو پێی بڵێ: مۆڵەتم بدە، تا توێشوو بۆ ئەو ڕۆژە ئامادەبکەم، پاشان وەرەوە گیانم بکێشە!

عەبدوڵا گوتی: ئەو هیچ کات مۆڵەت بە هیچ کەس نادات!

حەکیم وتی: کەواتە ئەگەر لە کاتی تاواندا ڕۆحی کێشایت چی دەکەیت؟

عەبدوڵا وتی: هەمووومان بەندەی خودای گەورەین، زۆر ڕاستە کە وتوویانە: «قسەی ڕاستو جوان لە حەکیمان ببیستە، لە خەوی بێئاگایی هەڵسەو بێدار بەرەوە».

# حەجکردنی خەلیفە هارون

خەلیفـە هاروون بە مەبەسـتی بەجێهێنانی فەریزەی حـەج کەوتە ڕێ، لە ڕێگـەدا چاوی بە باڵوولی حەکیم کـەوت، بینی وا حەکیم لەگەڵ منداڵان یاری دەکات، حەکیـم ئەوەنـدە خۆبەکەمزان بوو کە منداڵانیشـی بێبەش نەدەکرد، زۆرجاران بۆ بە خەشـینی خەندەو پێکەنینو خۆشی خستنە نێو دڵی منداڵان، لەگەڵیاندا گەمەی دەکرد، بێ گوێدانە پلەو پایەو تەمەنو زانستەکەی!

حەکیم کاتێك چاوی کەوت بە کاروانی جەنابی خەلیفە، هاواری کرد هارون.. هارون!

خەلیفە کە گوێی لێبوو وا کەسێك بە ناوی خۆیەوە بانگی دەکات، پرسی ئەو دەنگە کێ بوو بەو شێوەیە بانگی کردم.. وتیان ئەوە باڵوولە.

خەلیفە وتی: تامەزۆری بینینی باڵوولی حەکیم دەکەم، بانگی بکەن، بێئەوەی بی ترسـێنن. سەربازانی خەلیفە ڕۆیشـتن بۆ لای باڵوولی حەکیمو پێیان وت: جەنابی خەلیفە بانگت دەکات، بەڵام حەکیم وەڵامی نەدایەوە، دووبارە بانگیان کـردەوەو وتیان جەنابی حەکیم، خەلیفـە داوات دەکاتو دەیەوێت چاوی پێت

بکەوێت.. حەکیم وتی: من هیچ کارێکم بە خەلیفە نییە، ئەگەر خەلیفە دەیەوێت من ببینێت، پێویستە ئەو بێت بۆ لای من، دوای ئەوەی هەواڵەکەیان بردەوە بۆ خەلیفە، خەلیفە خۆی بە ڕێکەوتو ڕۆیشت بۆ دیتنی جەنابی حەکیم، هەر کە گەیشت بە حەکیم وتی: سڵاو جەنابی باڵووڵ. حەکیم وەڵامی سڵاوەکەی دایەوەو وتی: سڵاو لە بەڕێزتان فەرمانڕەوای باوەڕداران..

خەلیفە وتی: بانگم کردی، چونکە تامەزرۆی دیدارت بووم!

حەکیم زۆر ڕاشکاوانە وتی: بەڵام من تامەزرۆی دیداری تۆ نەبووم!

لەگەڵ ئەوەشدا خەلیفە ڕووی کردە حەکیمو وتی: ئامۆژگاریم بکە ئەی حەکیم!

حەکیم وتی: بە چی ئامۆژگاریت بکەم، پاشاکانی پێش تۆ «دەستی بۆ کۆشك و تەلارەکان ڕاکێشا»و وتی: ئەوە کۆشکو تەلارەکانیانە، ئەوەش گۆڕەکانیانە.

خەلیفە وتی: دەستت خۆشبێت، زیاتر ئامۆژگاریم بکە!

حەکیم وتی: فەرمانڕەوای باوەڕداران، هەرکەسێك خوای گەورە ڕۆزیو جوانی پێبەخشی، جوانییەکەی بە پاکی بەکارهێنا، سامانەکەی بۆ دەستگیرۆییو یارمەتیدانی نەداران بەکارهێنا، لە دیوانی چاکەکاران ناوی دەنووسرێت.

خەلیفە وا گومانی برد، کە حەکیم پێویستی بە شتێك هەیە، لەبەرئەوە وتی: ئەگەر قەرزداری فەرمان بدە تا قەرزەکەت بۆ بدەینەوە.

حەکیم وتی: نا فەرمانڕەوای باوەڕداران قەرز بە قەرز نادرێتەوە، مافەکان بگێڕەوە بۆ خاوەنەکانیان، قەرزیش بە هەمان هاوشێوەی خۆی بدەرەوە!

خەلیفە وتی: باشە فەرمان بدە، تا پارەو سامانت پێببەخشین، بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانتان.

حەکیم وتی: فەرمانڕەوای باوەڕداران، ئایا وا دەزانی خودای گەورە ڕۆزی بە تۆ بەخشیوەو منی لە بیرکردووە؟؟!!

پاشان پشتی هەڵکردو خەلیفەو یاوەرەکانی بەجێهێشت.

حەکیـــم ئەوەندە بیرتیـــژو وردەکارو زانا بوو، کە هەمووانـــی بە بیرۆکە جوانو وەڵامە بەهێزەکانو قسە نەستەقەکانی سەرسام کردبوو، بۆ هەر پرسیارێك وەڵامێکی بەهێز، بۆ هەرکێشـــەیەك، چارەســـەرێکی حەکیمانە، بۆ هەر ڕووداوێك هەڵوێستێکی ناوازە، بە جۆرێك چارەسەری گرفتو کێشەکانی دەکرد، کە هەمووانی سەرسام دەکرد، ئـــەوە لە کاتێکدا ئەگەر چارەســـەرەکە بۆ کەســـانی دیکەش بێت، ئـــەی ئاخۆ ئەگەر کێشەکە هی خۆی بووبێت، دەبێت چۆن چارەسەری کردبێت؟

لـــەم چیرۆکـــەدا باس لە کێشـــەیەك دەکەین کە دوچاری حەکیـــم خۆی هاتبوو.. حەکیم زۆرجار کە پارەیەکی لێ زیادبووایە، هەر لە ســـوچێکی حەوشـــەیماڵەکەیدا دەیشاردەوە، ڕۆژێك حەکیم پارەکەی گەیشتە سەد درهەم، هەرچەندە ئەو پارەیە بڕێکی ئەوتۆ نەبووە، بەڵام بە نیسبەت حەکیمەوە زۆر بوو، ڕۆژێك دە درهەمی لە خەرجی ڕۆژانەی زیادبوو، ڕۆیشت تا بیخاتە سەرپارەکانی، پینەچییەکی دراوسێی ئاگای لێبوو کە حەکیم پارەکەی شاردەوە، هەر کە باڵووڵ ماڵی جێهێشتو دوورکەوتەوە، پینەچی خۆی کرد بە ماڵی حەکیمداو ســـەرجەمی پارەکانـــی دەرهێناو بردی، کاتێك حەکیم گەڕایـــەوە ماڵ، ویســـتی ســـەیرێکی پارەکانی بکات، بەڵام ئەو کاتـــەی چووە جێگەی پارەکەی، تەنها یەك درهەمی لێنەمابوو!!

حەکیم بێئەوەی هیچ قســـەیەك بکاتو کەس تاوانبار بکاتو لای هیچ کەس باسی بـــکات، بیری لە پلانێك کردەوە بۆئـــەوەی پارەکەی بگێڕێتەوە، چونکە باش دەیزانی کە ئەو کەســـەی ئەو کارەی کردووە، لە نزیکی ماڵی خۆیەتی، هەربۆیە گومانی برد بۆ پینەچی دراوســـێیو بیری لە پلانێك کردەوە بێئەوەی هیچ کەس تێبگەیەنێتو پەنجـــەی تۆمەتی بۆ ڕابکێشـــێت، پارەکەی لە چنگ دەربهێنێتـــەوە.. ئەم کارەش بە کەسێکی وەکو حەکیم نەبێت، ئاستەم بوو بە کەسی دیکە ئەنجام بدرێت!

بۆ ئەو مەبەســـتە حەکیم ڕۆیشـــت بـــۆ لای کابرای پینەچیو ســـڵاوی لێکردو لە نزیکییەوە دانیشـــت، زۆر بە ئارامی لەگەڵی دواو وتی: کاکی برا بمبورە ڕەنگە ببمە ئـــەرك بۆ تـــۆ، دەمەوێت بۆ کارێك ڕاوێـــژت پێ بکەم، دەمەوێت هەمـــوو ئەو پارەو

ســامانەی کە لە شوێنان هەمە، هەموویان کۆبکەمەوەو بیانهێنمەوە بۆ لای خۆمو لە ماڵەکــەی خۆمدا بیشــارمەوە، ئیدی بۆ پارەکانم پەرشو بڵاو بنو هەر بەشــەی لە شــوێنێك بێت، ڕەنگە لە ماڵی خۆمان زیاتر پارێزراوتر بێت لە شوێنانی دیکە، کاکی پینەچی بە پێشنیارەکەی حەکیم زۆر خۆشحاڵبوو، لەبەرئەوە وتی: کارێکی زۆرباشە بێگومــان لە ماڵەکەی خۆت باشــترە تا شــوێنەکانی دیکە. حەکیم ئەوەندە شــوێنی حساب کرد کە پارەی لێ داناوە کە گەیشتە نزیکەی هەزار درهەم، پاشان ماڵاوایی لە دراوسێ پینەچییەکەی کردو وتی: باشترە هەر ئێستا بڕۆم بۆ کۆکردنەوەی پارەکانم، کاتێك دوورکەوتەوە پینەچی بە پەلە خۆی کرد بە ماڵی حەکیمداو تەواوی پارەکەی لــە شــوێنەکەی خۆی دانایەوە، چونکە بە خەیاڵی خــۆی ئەگەر حەکیم بگەڕێتەوەو ببینێت پارەکەی لەوێ نەماوە، ئەوە جارێکی دیکە پارە لەو شوێنە دانانێت، خۆئەگەر گەڕایــەوەو پارەکەی بینی لە شــوێنی خۆیەتــی، ئەوا هەزار درهەمەکەی دیکەشــی هەر لەو شــوێنە دادەنێ، ئەو کات لە بری ســەد درهەم، هەزارو سەد درهەمم دەست دەکەوێت، بێ ئاگا لەوەی کە حەکیم زۆر لەوە ژیرترە ئەو فێڵی لێ بکات!

حەکیــم دوای ماوەیەك گەڕایــەوە ماڵەکەی خۆیو بینی وا تــەواوی پارەکەی لە شوێنەکەی خۆی دانراوەتەوە، پارەکەی هەڵگرتو ڕۆیشتە دەرەوەو لە ماڵ دوورکەوتەوە، پینەچی هەرکەزانی حەکیم ماڵی جێهێشــتووە بە پەلە خۆی گەیاندە ماڵی حەکیمو چووە شــوێنی پارەکە، بەڵام بەداخەوە تەنها یەك درهەمیشــی لێ نەمابوو، ئەو کات کابرا تێگەیشــت کــە حەکیم زیرەکانــە پارەکەی خۆی دەســت کەوتۆتەوەو ئەویش مایەپووچانە لە ماڵ هاتەدەرەوە، هەر دوای ئەو ڕووداوە حەکیم ماڵەکەشی گواستەوە بۆ گەڕەکێکی دیکە، چونکە ناکرێت مرۆڤ لە دراوسێکەی ئەمین نەبێتو لە نزیکیەوە ژیان بگوزەرێنێت.

بالووڵی حەکیم

# ماسی تازە

ڕۆژێك حەكیم حەزی بە خواردنی ماسـی دەكرد، بۆ ئەو مەبەسـتە بەردو بازاڕ ڕۆیشتو چوو بۆ لای ماسی فرۆشەكان، حەكیم ماسییەكی هەڵگرتو بە دیقەتەوە لە كلكی ماسـییەكەی دەڕوانی، تا بزانێت بە كەڵكی خواردن دێت، یان نا، بە مانایەكی دیكە ئایا ماسـییەكە تازەیە، یان كۆن.. لەو كاتەدا فەرماندەی پۆلیسی شاری بەغداد باڵووڵـی حەكیمی بینی وا ماسـییەكی بە دەسـتەوەیەو لە بری ئەوەی بۆ سـەلكی ماسییەكە بڕوانێت، دیقەتی لە كلكی ماسییەكە گرتووە!

كاتێك فەرماندەی پۆلیس ئەم دیمەنەی باڵووڵی حەكیمی بینی بەلایەوە سـەیر دەبێت، هەربۆیە بانگی دەكاتو دەڵێت: باڵووڵی حەكیم ماسی ئاوا دەپشكنی؟ سەیری سەلكی ماسییەكە بكە، بزانە خراپ بووە، یان نا، نەك كلكی ماسییەكە!

باڵووڵی دانا وەڵامی دایەوەو وتی: سەلكی ماسییەكان هەر زۆر دەمێكە خراپ بوون، من دەمەوێت سـەیری كلكی بكەم، تا بزانم تێكچوونو خراپ بوونەكە، گەیشتووەتە كلكیشی، یان نا؟!

# بالوول و شەپۆلەکانی دەریا

حەکیم لە هەر کوێیەک بووایە، هەر کێشـەیەکی ببینیایە، بە ئاسانترین شێوەو کەمتریـن کات چارەسـەری بـۆ دەدۆزییەوە، بـە جۆرێك کـە هەمووانی بەوەڵامو چارەسـەرەکان سەرسـام دەکـرد، جارێکیان بازرگانێـك لەگـەڵ خزمەتکارەکەیدا بەمەبەسـتی بازرگانی دەیانەوێت بە کەشـتی گەشـت بکەن، کاتێك کەشـتییەکە

بــە تەواوی سەرنشــینەکانییەوە دەکەوێتــە ڕێ، خزمەتکاری بازرگانەکە لە ترســی شــەپۆلەکانی دەریــا، دەســت دەکات بە هاوارکــردنو پاڕانەوەو شــیوەنو گریان، بە جۆرێــك کە گریانو هاوارکردنی تەواوی سەرنشــینانی بێتاقــەت کردبوو، هەربۆیە سەرنشــینان داوایان لە بازرگانە کرد بە هەر جــۆرێ بووە خزمەتکارەکەی بێدەنگ بکات، بازرگان هەرچەندە هەوڵی دا تا ئارامی بکاتەوەو لە هاوارکردنو دەنگە دەنگ دەســت هەڵگرێ، بەڵام ســودی نەبوو، تا دەهات لە ترسی شــەپۆلەکانی دەریا، زێتر دەنگی بەرزدەکردەوەو گریانو شــیوەنی پتر تر دەبوو.. حەکیم داوای لە بازرگانەکە کــرد کە ڕێگەی بدات تــا ئەو بێدەنگی بکات.. بازرگانیش کە زۆر شــەرمەزاری لای سەرنشینانی کەشتییەکەو هاوڕێیانی بوو، چونکە خزمەتکارەکەی هەمووانی هەراسان کردبــوو، وتی: هەر چییەکت پێدەکرێو بە هەر شــێوەیەك دەتوانیت بێدەنگی بکە مەمنونت دەبین..

باڵووڵ فەرمانی کرد کەشتیەکە ڕابووەستێنن، دواتر فەرمانی کرد کە خزمەتکارەکە فڕێ بدەنە ناو دەریاکەوە.. تا تەواو ماندوو دەبێت لە ئاوەکەدا، ئەوانیش فەرمانەکەیان بەجێهێناو خزمەتکارەکەیان خســتە نێــو دەریاکەوە، تا تەواو پەلەقاژەی پێنەکەوت دەریان نەهێنایەوە، کاتێك تەواو ماندوو بوو لە ئاوەکەدا ئەو کات دەریان هێنایەوە، کاتێك خزمەتکارەکە هاتەوە ناو کەشــتییەکە زۆر بە ئارامیو بێدەنگی لە سوچێکی کەشتییەکەدا دانیشت!

سەرنشــینانی کەشــتییەکە لە حەکیمیان پرسی: بۆچی ئەو پیاوەی فڕێدایە ناو دەریاکەوە؟ چۆن بوو پیاوەکە ئاوا لە هاوارکەوتن کەوتو ئێستا بە ئارامی دانیشتووە؟

حەکیم وتی: ئەو پیاوە لە نێو ئەم کەشــتییە ئارامەدا دەترســاو هاواری دەکرد، کاتێك چووە نێو دەریاکەوەو شــەپۆلی دەریاکەی بینی، ئەو کات هەســتیکرد کە ناو کەشتییەکە چەندە ئارامە! هەربۆیە ئێستا بە بێدەنگیو ئارامی بۆ خۆی دانیشتووە!

مرۆڤ قەدری ئارامی نازانێت، تا ئەو کاتەی لە دەستی نەدات!

باڵوولی حەکیم

# وەلامە بەهێزەکانی حەکیم

حەکیم زۆرجار ســەردانی کاربەدەســتانو قازیو فەرمانڕەوایانی شاری بەغدادی دەکرد، لە هەر سەردانێکیدا وانەیەکی گەورەو چیرۆکێکی پەندئامێزی بۆ دوای خۆی



جێهێشــتووە.. لە چیرۆکی ئەمجارەدا باس لە سەردانی حەکیم دەکەین بۆ لای قازی شاری بەغداد، ڕۆژێکیان حەکیم سەردانی جەنابی قازی کردو لە نزیکییەوە دانیشت، لــەو کاتــەی پێکەوە گفتوگۆیان دەکرد، جەنابی قازی قەڵەمەکەی لە دەســت کەوتە خــوارەوە، حەکیــم بە جەنابی قازی گوت: قوڵینگەکەت لە دەســت کەوتە خوارەوە! قازیــش بە گاڵتەجارییەوە گوتی: زۆر ڕاســتە کە دەڵێن تــۆ دێوانەی! ئەوە قەڵەمە، یاخود قوڵینگ؟؟!!

حەکیــم بە ئارامییــەوە گوتی: جەنابی قازی من وادەزانــم کە دێوانە تۆی نەك من، چونکە نازانی بە فەرمانێك کە بەو قەڵەمە دەینوسیت، ماڵی خەڵکی پێ کاول و وێــران دەکەیت، «چەندین لانە بە هۆی قەڵەمی قازییەکانەوە وێران بوون، ســەدان زانا بە فەرمانێك کە بە قەڵەمی دادوەران نوســراوە لە نێو تاریکاییەکانی زیندانda، ژیان دەگوزەرینن»، ئێستا تۆ پێم بڵێ ئەوە قوڵینگە، یان قەڵەم؟؟

مەبەستی حەکیم ئەوەبوو، کە چۆن قوڵینگ دیوارو خانووی پێ دەڕووخێت، هەرواش قەڵەمەکــەی جەنابی قــازی ئەگەر بە دادپەروەرانە بــەکاری نەهێنێت، ئەوە لە بری ئەوەی خزمەت بکاتو ماڵی خەڵکی ئاوەدان بکاتەوە، ماڵی خەڵکی وێرانو کاول دەکات.. لــە بری ئەوەی دزو جەردەو پیاوکوژو خوێنڕێــژەکان بخاتە نێو زیندان، بێتاوانەکان دەکاتە نێو ژوورە تاریکەکانی زیندانو یاســاکان بە ســەر هەژارانو بێ دەســەڵاتو بێ نەوایاندا جێبەجێ دەکات، بەڵام گەورەو خاوەن پلەو پایەو دەوڵەمەندانیش هیچ کات یاســاکان کە بە پێنووسی قازییەکان دەنوسرێت، جگە لە بەرژەوندیی ئەوان وشەیەکی دیکــە تۆمار نــاکات، تاوانبارانو ئەوانەی شایســتەی ژوورە تاریکەکانــی زیندانن، لە شەقامەکاندا پیاسە دەکەنو چۆنیان بوویت وەها ژیان دەگوزەرێنن!

خــۆ ئەگەر هەژارێکیش تاوانێك ئەنجام بدات، ئەوا چەندین ســاڵ لە نێو ژوورە تاریکەکانی زینداندا ژیان دەگوزەرێنێت!

زۆر ڕاســتە کە وتویانە: «یاســا وەکــو تەونی جاڵجاڵۆکە وایــە، بچووکەکان تێی دەکەون، گەورەکانیش دەیشکێنن»!



# ئامۆژگاری باڵووڵ بۆ خەلیفە هاروون

ڕۆژێکیان خەلیفە هارون چاوی بە باڵووڵی حەکیمو دانا کەوت.. پێی گوت: باڵووڵی حەکیم ئامۆژگاریم بکە..

باڵووڵ گوتی: باوکو باپیرانت، خەلیفەکانی پێش تۆ لە کوێن؟ خەلیفە هارون گوتی: ماڵاواییان لە ژیان کردووەو کۆچی دواییان کردووە..

باڵووڵ: ئەی کۆشکو تەلارەکانیان لە کوێیە؟ هارون: ئاماژەی بۆ کۆشکو تەلارەکانیان کردو وتی: ئەوانە کۆشکو تەلارەکانی ئەوانن..

پاشان باڵووڵ گوتی: ئەی گۆڕەکانیان لە کوێیە؟

خەلیفە هارون: ئاماژەی بۆ گۆڕستانەکەیان کردو وتی: ئەوەش گۆڕەکانیانە..

باڵووڵ گوتی: کەواتە ئەوە کۆشکەکانیانەو ئەو بەرەوەش گۆڕەکانیانە، دڵنیام کە

کۆشکەکانیان هیچ سودێکیان پێناگەیەنێت لە گۆڕەکانیاندا!

هارون وتی: زۆر ڕاستە.. زیاتر ئامۆژگاریم بکە..

باڵـوول گوتـی: کۆشـکەکانی تۆش لـە دنیادا گەلـەك فراوانو خۆشـن، خۆزگە گۆڕەکەشت لە پاش مردنت فراوانو خۆش دەبوو!

هارون دەستیکردە گریانو گوتی: زیاتر ئامۆژگاریم بکە..

باڵـوول گوتی: ئەگەر تۆ ببیتە خاوەنی گەنجینەو خەزێنەکانی کیسـرا، سـەدان سـاڵیش تەمەنت بێت، ئایا گۆڕ کۆتاماڵو دوا ئارامگەی هەموو مرۆڤەکان نییە، لە بارەی هەموو ئەو شتانەوە پرسیارت لێناکەن کە تۆ بوویتە خاوەنی؟

خەلیفە گوتی: بێگومان..

پاشان هارونە ڕەشید گەڕایەوە ماڵەوە، پاش ماوەیەك نەخۆشکەوت، نەخۆشییەکەی تەنها چەند ڕۆژێکی خایاند، هەسـتیکرد نەخۆشی مەرگەو هەستانەوەی ئاستەمە... وتـی: هەموو سـوپاکەم بـۆ ئامادە بکەن، با هەمـووان شمشـێرو قەڵغانەکانیان بە دەسـتەوە بێـت، هەموویان بە فەرمانی خەلیفە لە گۆڕەپانی شـاردا کە ژمارەیەکی یەکجـار زۆربـوون، ئامادەبـوون، کاتێك خەلیفە چاوی بەو سـوپا زەبەلاحە کەوت، دەستیکردە گریان، پاشان وتی:

ئەی ئەو زاتەی کە هەرگیز موڵکو دەسەڵاتت لەناوناچێت، بەزەییت بێتەوە بەو کەسـەدا کە موڵکو دەسـەڵاتی لەناودەچێت!! خەلیفە بە گریانەوە ئەوەی گوتو بۆ دواجار چاوەکانی لێکناو ماڵاوایی یەکجاری لە ژیان کرد..



«هێزو دەسەڵاتو سوپاو سەربازی زۆرو موڵکو سەروەتوسامان، ناتوانێت مرۆڤ لە مردن ڕزگاربکات».

# پێڕست



کاتێکی خۆش، بەسەر بەرە لەگەڵ حیکمەتو دانایی، پەندو ئامۆژگاریی، وتەی جوانو پڕمانا، تێکەڵ بە بزەو پێکەنینو قسەی خۆشو بە توێکڵ، لەگەڵ حەکیمی دانا، باڵووڵی مامۆستای عاقڵاندا!

نرخ: «٤٠٠٠» دینار